# پێشەوای دانایی
# لوقمانی حەکیم


**نووسەر**
عبدالباقی یوسف
**وەرگێڕانی**
مزەفەر عەولا قەسرێی
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
**نەخشەسازی ناوەوە**
**خـــــەت**
نــەوزاد کۆیــی
**بـــــــەرگ**
أمــــین مخلص
**قەبارەی کتێب**
۱٤×۲۱- (۱۳۷) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ۱٤۳۷ ك - ۲۰۱٦ز
**تـــــیراژ**
۱۰۰۰ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی (۸۷٦) ی ساڵی ۲۰۱٤ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

# بەرکۆڵ

ستایش بۆ خوای دانا کە لە کتێبە پڕ داناییەکەی خۆیدا ستایشی دانایی کردووە..

درودو سڵاویش لەسەر پێغەمبەری دانا، کە ڕێبازی پەیامەکەی دانایی بو، ڕەزامەندی خواش برژێ بەسەر یار و یاوەر و شوێنکەوتووانی..

مرۆڤایەتی بە قۆناغی ئەزموندا دەڕوات و هەوڵدەدات پەند و ئامۆژگاری لێوەربگرێت و لە قاڵبی وتە و پەند و ئامۆژگاریدا دایان بڕێژێتەوە، تا بۆ نەوەکان بە میرات بمێنێتەوەو ببێتە ئامرازێکی پەروەردەکردن و ئاراستە کردنێکی باش.

ویژەی عەرەبی لەکۆن و ئێستاشدا سەرچاوەیەکی گرنگی دانایی بووە، هەروەك چۆن لەلای مسوڵمانان لە ڕێی ئەو چەند ئایەتەی سورەتی (لقمان) دا ئەوە خراوەتەڕو، کە کەسایەتییەکی دانا هەبووە، ئەویش کەسایەتی (لوقمانی حەکیم)ە.

ئەو ئامۆژگارییانەی لوقمانی حەکیم هەمو خاسیەتەکانی پەروەردە و چاکسازی ژیانی مرۆڤیان لەخۆ گرتووە؛ لە بیروباوەڕ و پەیوەندی مرۆڤ بە خواو دایك و باوكەوە پەیوەندی لەگەڵ برای مرۆڤی خۆی و خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتە جوانەکان، کە پلە و پایەی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا بەرز دەکەنەوە.

پەرتوکە کۆنەکان چەندەها پەندیان تێدان کە دراونەتە پاڵ لوقمانی حەکیم، کە هەمویان پەیامی ئەوەیان هەڵگرتووە، کە دانایی شایەن بە لوقمانە.

ڕۆماننوس(عبدالباقي يوسف) هەستاوە بە داڕشتنەوەی ئەو پەند و

وتانە بە شێوەی ڕۆمان، کە مرۆڤ لە خوێندنەوەیدا چێژ وەردەگرێت و دەبێتە مەشخەڵێك بۆ ڕوناك کردنەوەی ڕێگای ژیانی..

ڕۆمانەکە بەهۆی زاڵبونی چەمکی دانایی بەسەریدا هەوڵدەدات دانایی بکاتە کەسایەتییەك و کاریگەری لەسەر هەمو کەسایەتییەکانی دەوروبەری دابنێت؛ بەسەر خێزان و کۆمەڵگا و لایەنی دەرونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری.

ئەم ڕۆمانە مژدەی مرۆڤی دانای هەڵگرتووە، بۆ سڕینەوەی چەمکی پیاوی ئایینی، و گەلی و ڕەگەزی و سپی و ڕەش و ئایدۆلۆژی و پراگماتی و میکافیلی و جۆرەکانی تری مرۆڤایەتی، کە شوێنەواری خراپ بەسەر ژیارستانییەتی گەل و نەتەوەکاندا جێدێڵێت..

یەکێك لە گرنگترین ئەو پرسانەی ڕۆمانی (پێشەوای دانایی) دەی وروژێنێت، ژیاننامەی لوقمانی حەکیمە، هەرچەندە ئەو ڕۆمانە تاکە ڕۆمان نییە ئەو پرسەی وروژاندبێت، بەڵکو لە ڕەخنەی ئەدەبیدا باسکراوەو جۆرجی زێدان لە ڕۆمانە مێژووییەکانی ئاماژەی پێکردووەو، چیرۆکنوس(محمد عبدالحليم عبدالله) لە ڕۆمانەکەیدا(الباحث عن الحقيقة)دا باسی کردووە و، نەجیب گەیلانی لە زۆر لە ڕۆمانەکانی وەکو: (نور الله) و (قاتل حمزه) و (عمر يظهر في القدس) دا ئەو پرسەی وروژاندووە.

ئەگەر هەندێ ڕۆمان لە زۆر لایەندا پشتیان بە خەیاڵ بەستبێت، بە جۆرێك کە زیانی بە لایەنە مێژووییەکە گەیاندبێت، ئەوا (عبدالباقی یوسف) بۆ هەندێك لایەنی جوانکای مێژویی نەبێت، لە سنورە مێژووییەکە لاینەداوە، ئەمەش تابلۆ مێژووییەکە سەرنجڕاکێشتر دەکات و هێزێکی کاریگەر تری پێدەبەخشێت.

ڕۆمانی (پێشەوای دانایی) پەیامی ئەوەی هەڵگرتووە، کە مرۆڤ ببێتە ئاوێنەی دەرونی خۆی و تیایدا پەیوەندییەکانی و ڕەفتار و

هەڵوێستەکانی خۆی ببینێت و دوبارە چاو بە ژیان و بووندا بخشێنێتەوەو هێزی زیرەکی و بەڕێوەبردن و ئەزمون بەدەست بێنێت، کە خوا پێی بەخشیوە، بۆ ئەوەی جڵەوی لە دەستی خۆیدا بێت و تێڕوانینەکانی دەربارەی پێگەی خۆی لە گەردون و ژیان و پەیوەندی بە خوا و مرۆڤ و ڕووەك و بێگیانەکاندا دوبارە دابڕێژێتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر چێژ لە ژیان وەربگرێت و بتوانێت هاوسەنگی لە ژیانیدا دروست بکات..

نوسینگەی (التفسير) بە خۆشحاڵییەوە ئەم شاکارە وێژەییەتان پێشکەش دەکات، بە مەبەستی وەبیرهێنانەوەی گرنگی دانایی لە هەمو بوارەکانی ژیاندا، ئەو داناییەی لە قورئانی پیرۆزدا مەتحی کراوەو لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزندا بە شێوەیەکی کردەیی تەفسیر کراوە.

هەر خواش لە نیازەکان ئاگادارە و دانایی بەو کەسە دەبەخشێت کە دەیەوێت. هەر کەسێکیش دانایی پێبەخشرا، ئەوا خەڵاتێکی گەورەی پێشکەش کراوە.

* * *

# پێشەکی

بە خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ئەو ڕۆمانە هەلی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێت، کە بچینە ناو ژیانی جوانی خۆرهەڵاتی گۆی زەوی و دانایی لە ژیانی مرۆڤایەتییەکاندا، لە ڕێگەی توێژینەوەی ژیانی یەکێك لە گەورەترین پێشەواکانی دانایی مێژوی مرۆڤایەتی.

ئەو پیاوەی کتێبە ئاسمانییەکانی دوای ئەو پڕن لە باسی داناییەکەی.. لەبەر گرنگی پێگەی ئەوپیاوە بەڕێزەو وەك ڕێزێك بۆ ئەو خزمەتەی پێشکەشی کردوین، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هێناوەو هەندێك لەو ئامۆژگارییانەی بۆخستوینەتەڕو، کە پێشکەشی کوڕەکەی کردووە و لە قورئاندا سورەتێکیشی بە ناوی ئەوەوە ناو ناوە. هەروەك چۆن کاریگەرییەکی بێ وێنەی لەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤایەتی داناوە، بە چاوپۆشین لە ڕەگەز و ڕەنگەکەیان.

ئەم ڕۆمانە یەکەمین کتێبە-بەشێوەی ڕۆمان- ژیاننامەی دانای گەورەی ڕۆژهەڵات (لوقمانی حەکیم) دەتوێژێتەوە، لە قۆناغی کۆیلایەتی، بە تێپەڕبون بە قۆناغی ئازاد بونی..

پاشان قۆناغی ئازادی تەواو و هاوسەرگیری و تاقیکرانەوەی بە مردنی منداڵەکانی و هاوسەرەکەی و گەڕان بە کون و کەلەبەرەکانی زەویدا..

هەروەها ئەم ڕۆمانە تێڕوانینی ئەو دانایەی لە خۆ گرتووە بۆ مرۆڤ و دانایی، تێڕوانینی بۆ مرۆڤ و دنیا و دوارۆژ و ئافرەت و هاوسەرگیری و باوکایەتی و کارەساتەکان و پەیوەندییە مرۆییەکان و ماڵ و سامان و ئازادی..

هەروەها ئەو قۆناغە گرنگەی ژیانی لەخۆ گرتووە، کاتێك بانگەوازێکی گوێ لێبو:
ئەی لوقمان، دەتەوێ خوا بتکات بە جێنشین لەسەر زەویداو بە دادگەری دادوەری لەنێو خەڵکدا بکەی؟
دەکەوێتە سەر ئەژنۆ و بەترس و لەرزەوە دەڵێت: ئەگەر پەروەردگارم سەر پشکم بکات، ئەوا سەلامەتی هەڵدەبژێرم، بەڵام ئەگەر فەرمانم پێبکات، ئەوا بەسەر سەر و سەر چاوم قەبوڵی دەکەم، چونکە دەزانم کە پشتم دەگرێت..
لە رێگەی قۆناغە مێژوییەکانی بونی ئەو کەسایەتییە لە جیهاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە کێشەی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان نەبونی پیاوی دانا و داناییە و بۆمان دەردەکەوێت، کە چۆن دانایی دەتوانێت خزمەتێکی زۆر پێشکەشی مرۆڤ بکات و بەرزی بکاتەوە..
ئەم رۆمانە زۆربەی ئەو وتانەی ئەو مرۆڤە دانایە بۆی جێهێشتوین بۆمان دەخاتەرو. لە پەند و ئامۆژگاری و دیداری لەگەڵ پێغەمبەر داوود و گفتوگۆی دانایی و پێغەمبەرایەتی.

* * *

# بەشی یەکەم

کۆیلە ڕەشپێستە باڵا کورتە لێو ئەستورە پانی قلیشاوە جوانڕۆ هێمنەکە سەرقاڵی گوزەرانی بو.
لەنێو کۆیلەکانی تری هاوڕێی دا وەك گەورە مامەڵەی دەکرد، بەیانیان زو لەگەڵیاندا دەچو بۆ دار کۆکردنەوە، لە هەمو خۆشی و ناخۆشییەکدا لەگەڵیاندا بەشداری دەکرد، لەیەك ژوردا لەگەڵ ئەواندا دەخەوت، هەر لەگەڵ ئەوانیشدا بەیانی دەکردەوە، بەر لە هەمووان لەخەو هەڵدەستاو دوای هەمووان دەخەوت.
خواردن و خواردنەوەی لەگەڵ ئەواندابو، تا درەنگانی شەو لەگەڵیاندا دەمایەوە، بەخۆشییان دڵخۆش دەبو، بە ناخۆشییان دڵتەنگ دەبو.
بۆ تەنیا ساتێکیش وای نەدەکرد هەست بکەن ئەویش وەك خۆیان کۆیلەیە؛ چ لە شێوازی گفتوگۆیدا، یان لە ڕوانینیدا، یان لە گرنگیدان و باش گوێگرتن و ڕاستی و گاڵتەجاڕیدا، یان لە ڕێکخستنی کاتدا، یان لە ڕەفتار و تێڕوانینی تایبەتی بۆ ژیان..
هیچ کۆیلەیەك نەیدیبو تف فڕێ بدات،
هیچ کەس نەیدیبو بە قاقا پێبکەنێت،
یان تانەو تەشەر لە بونەوەرێك بدات.
هیچ گوێچکەیەك ناڵەناڵی ئەویان نەبیستبو،
یان بە دەنگی بەرز قسە بکات،
هیچ چاوێك نەیدیبو کاتێك دەچووە سەرئاو،
یان خۆی دەشۆرد.

ئەو لە هەر ڕەفتارێکیدا دڵکار و ژیرانەبو؛
لەهەر وشەیەك کە لەدەمی دەردەچو،
یان هەر نیگایەك کە سەیری کەسێکی دەکرد،
لە هەموو کارێکیدا ورد و دووربین بو.
لە کاتی دەست بەتاڵیدا ڕێی بەخۆی نەدەدا لە یاری و گاڵتەو گەپدا بەشدارییان بکات، بەڵکو تەنیایی و بێدەنگی و بیرکردنەوەی هەڵدەبژارد.
تەنانەت هەندێکیان کاتێك دەیانویست قسەی لەگەڵ بکەن ترسیان لێدەنیشت، هەستێکی وایان لەلا دروست دەبو وەك ئەوەی کە خەریکە لەگەڵ گەورەیەکدا قسە دەکات، نەوەك لەگەڵ کۆیلەیەك کە لەگەڵیاندا دەژی..
کۆیلەکان بە زمانی گلەیی و گازاندەوە پێیان دەگوت ئەوە چیتە بۆچی یاریمان لەگەڵدا ناکەی، بۆچی لە هیچ شتێکدا بەشداریمان ناکەی؟ ئەی تۆش وەکو ئێمە کۆیلە نیت؟ یان بیرکردنەوەی زۆر وای لێکردوی وا هەست بکەی کە بە هەڵە لەگەڵ کۆیلەکاندا دەژی؟
چاو لە چاوەکانیان دەبڕیێ،
بە وردی سەرنجی دەموچاویان دەدات،
سەرنجی ڕوانینەکانیان،
سەرنجی ڕوخساریان دەدات،
بە سەرنجەوە بەرانبەریان دەوەستێت،
بە ڕێزەوە گوێیان لێدەگریێ، بەبێ ئەوەی تەنانەت وشەیەکیشی لە دەم بێتە دەرەوە، لە ترسی ئەوەی نەوەك قسەیەکی هەڵە لە دەمی دەربچێت و بیخاتە پێگەی تۆمەتبار و ئەوانیش دادوەر، یان ئەو وشەیە ببێتە هۆی پچڕاندنی ئەو پەیوەندییەی کە ئەوانی پێکەوە کۆکردۆتەوە، ئەو پەیوەندییەی هەمو هەوڵێکی لە پێناو پاراستنی داوە، بەڵام لەلایەکی

ترەوە هەوڵی دەدا واهەست نەکەن، کە ئەو نایەوێ قسەیان لەگەڵدا بکات، ئەو دەربارەی هەندێ شتی دیکە قسەی لەگەڵدا دەکردن، پێ دەگوتن کە پێویستە ئاگاداری ئەوەبن کە لەلای خوا ئەوان کەمتر نین لە گەورەکانیان، پێویستە بۆ تەنیا ساتێکیش بیریان نەچێت کە ئەوان بەندەی خوان و گەورەکاشیان وەك ئەوان بەندەی پەروەردگاری مرۆڤە ئازاد و کۆیلەکانە.

ئەو قسانە دەبونەهۆی ئەوەی زیاتر ڕێزی بگرن، زیاتر متمانە بە دانایی و بیریاری ئەو بکەن..ئەوان بە ناڕاستەوخۆ هەوڵیان دەدا داوای لێبوردنی لێبکەن لەسەر ئەوەی کە گومانی ئەوەیان پێبردبو کە خۆی پێ لەئەوان گەورەترە!

ئەو (لوقمان)ەکەیانە کە هۆگری بوون..

لە تاریکایی شەودا، لە ناو پێخەفی بیرکردنەوەدا ئەم لاو ئەو لای دەکرد، لەنێو خەوی قوڵ و پرخەپرخی کۆیلەکاندا دەچووە قوڵایی بیرۆکە یاخییەکانی.

بیری لە هەر کردارێك دەکردەوە کە ئەندامەکانی لەشی ئەنجامیان دابو؛

هەر وشەیەك کە لەدەمی هاتبێتەدەر،

هەر وشەیەك بە گوێکانی بیستبێتی،

تەنانەت هەمو ئەو دیمەنانەشی دێنانەوە بەرچاوی کە بینیبونی..

پاشان وەك بونەوەرێك بیری لە بایەخی ژیان دەکردەوە و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

لوقمان ئەو ناوەیە کە تۆ بەکەسانی دی دەناسێنێ، تۆش ناوی لوقمانیان پێدەناسێنی.

هەرچەند باشتر ناوی خۆت بە کەسانی دی بناسێنی چاکتر دەتناسن..

تۆ لەنێو ئەو پێنج پیتەی ناوەکەتدا ڕەنگ دەدەیتەوە،

لە ئاسۆکانیدا تروسکەکانی بیرکردنەوەت دەدرەوشێنەوە،

تۆ ئەی لوقمان کوڕی تاریکی و ڕوناکی ئەو پیتانەی، ئەویش کچی هەر یەکێك لە جوڵەکانتە،
هی هەر هەناسەیەکت،
هەر هەستێك لە هەستەکانت،
هەر ساتێك لە ساتەکانت،
هەر بونەوەرێك ناوێکی هەیە کە دەیناسێنێ، هەر ناوێکیش بونەوەرێك دەناسێنێ،
هەر بونەوەرێك بە ناوێك دەست بە ژیان دەکات، ناوەکەش بە ژیانی ئەو دەست بە ژیان دەکات.
کاتێك خودا ژیانی بەبەر یەکەمین جێنشینی خۆیداکرد، نەمری بە ناوەکەی بەخشی..
ئامادەبونی ناوەکەت ئامادەبونی نەبونتە
ئامادەنەبونی ناوت ئامادەنەبونی بونتە!
کاتێك چاکە لەگەڵ ناوەکەتدا دەکەی ناوەکەشت چاکەت لەگەڵدا دەکات.
ناوەکەت خراپەت لەگەڵدا دەکات کاتێك خراپەی لەگەڵدا دەکەی.
خوا ناوی بە هەمو فریشتەیەك بەخشیوە..
خوا ناوی بە هەمو مرۆڤێك بەخشیوە..
خوا ناوی بە هەمو ڕووەکێك بەخشیوە..
خوا ناوی بە هەمو گیانەورێك بەخشیوە..
ئەگەر لە خۆشت ووردبیتەوە ئەی لوقمان دەبینی کە:
هەر ئەندامێکت ناوێکی هەیە..
هەر هەناسەیەك کە هەڵیدەمژی ناوێکی هەیە..
هەر هەناسەیەك کە دەیدەیتەوە ناوێکی هەیە..
هەر نیگایەکت ناوێکی هەیە..

هەر هەنگاوێکت ناوێکی هەیە..
هەر دەنگێکت ناوێکی هەیە..
هەر دانیشتنێکت ناوێکی هەیە..
هەر وەستانێکت ناوێکی هەیە..
هەر خەوتنێکت ناوێکی هەیە.
جا ئەی لوقمان ببینە کە:
هەر باڵندەیەك کە دەفڕێ ناوێکی هەیە..
هەر ئاژەڵێك کە لەسەر زەوی دەڕوات ناوێکی هەیە..
هەر گوڵێك کە دەپشکوێ ناوێکی هەیە..
هەر درەختێك کە گەشە دەکات ناوێکی هەیە..
هەر ڕووەکێك کە دەڕوێت ناوێکی هەیە..
هەر دەریایەك شەپۆل بدات ناوێکی هەیە..
هەر ڕوبارێك ئاوی لێبڕوات ناوێکی هەیە..
هەر چیایەك کە بەرز بۆتەوە ناوێکی هەیە..
هەر زەمینێك کە ڕاخراوە ناوێکی هەیە..
بۆ چەند ساتێك لە بیرکردنەوە دەوەستێت، لەنێو جێگاکەیدا ئەم لاو ئەولا دەکات، هەوڵدەدات بخەوێت، مێشکی ماندو بووە، بەڵام هەر بەردەوام دەبێت:
ئەی لوقمان سەرنجی کات بدە:
هەر ساتێك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
سات..، چرکە..، خولەك..، کاتژمێر..، ڕۆژ..، هەفتە..، مانگ..، وەرز..، ساڵ..، دەیە..، سەدە...
دواتر سەرنجی ژمارەکان بدە:
هەر ژمارەیەك ناوێك تایبەتی خۆی جیاواز لە ژمارەکانی تری هەیە..
سەرنجی ئاسمان بدە:

هەر ئەستێرەیەك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
هەر چینێکی هەور ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
هەر هەسارەیەك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
هەر ساتێکی تاریکی ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
هەر ساتێکی ڕوناکی ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە..
ئەوە دەوڵەمەندی خوایە ئەی لوقمان، دەوڵەمەندانی زەمین بەبەراوورد بەمە چیان هەیە؟ دەوڵەمەندترینی زەمین هەژارترینیانە بۆ دەوڵەمەندی خوا.

# بەشی دووەم

لەوەتەی قاچی خستۆتە ئەو شوێنەوە تاو ناتاوێك گەورەكەی بۆ دانیشتن و قسەكردن بانگی دەكات، داوای لێدەكات باسی تێڕوانینی خۆی بكات بۆ ژیان، بۆ پەیوەندی مرۆڤەكان بە خواوە، داوای لێدەكات كە بە تێروتەسەلی باسی خوای بۆ بكات، پاشان هەندێك پرسیاری تایبەتی لێدەكرد، كە شەرم دایدەگرت..
گەورەكەی هەندێ كات زۆر ڕێزی دەگرت، هەندێ كاتیش تەنانەت زەردەخەنەیەكیشی بەرانبەر نەدەكرد.
كاتێك گەورەكەی لە بارودۆخێكی خراپدا بوایە بە توڕەیی پرسیاری لێدەكرد و ئەویش بە ترس و لەرزەوە وەڵامی دەدایەوە، بەڵام سەرەڕای ئەو ڕووگرژییەش هێشتا هەر وای هەستدەكرد كە ڕێزی دەگرێت و هەر كاتێك لە تەنگ و چەڵەمەیەكدا بێت بەدوایدا دەنێرێت و پرس و ڕاوێژی پێدەكات و وای هەستدەكرد كە گەورەكەی ڕێزی دەگرێت و قسەكانی ئارامی پێدەبەخشن، ئەگەرچی هەندێ كاتیش بە توڕەییییەوە وەڵامی بداتەوە..
لەلایەكی دی وای هەستدەكرد، كە گەورەكەی زیاتر پێویستی بەو هەیە نەك ئەو بە گەورەكەی، چونكە ئەو دەتوانێت شتێكی وای پێشكەش بكات كە كۆیلەكانی تر تەنانەت خۆیشی ناتوانێت ئەو كارە بكات..
ئەو دەیتوانی ڕوداوەكان بە دانایی و تێگەیشتنێكی تەواو تێبگات، بۆیە چاك دەیزانی كە گەورەكەی بۆ ئەوە بانگی دەكات تا ئازارە

ڕۆحییەکانی لەسەر سوك بکات، یان شوێنەواری ئەو کارەساتانەی بۆ بسڕێتەوە کە توشی بووە، ئەویش سەرکەوتووانە ئەو کارەی ئەنجام دەدا، تەنانەت گەورەکەی وا فێرکردبو کە لە کاتی ڕودانی هەر کارەساتێکی نەخوازراو وا هەست بکات کە ئەوە لە خواوە بووەو هەردەبو ڕوبدات، بۆیە سوپاسگوزاری خوای دەکرد و بە چاوی ڕێزەوە سەیری لوقمانی دەکرد..

گەورەکەی وای هەستدەکرد کە ئەوەی لوقمان هەیەتی لە پارەو سمان و تەنانەت لە ئازادیش باشترە، چونکە ئەوەتا کەسێکی کۆیلە ئامۆژگاری کەسێکی ئازاد دەکات..

وەك هەمیشە، گەورەکەی لوقمانی بانگ کرد، دوای ماوەیەك خزمەتکارەکان میوە و خواردنیان بۆ هێنا، دوای ماوەیەك لە دانیشتن و بێدەنگی، گەورەکەی بە بێتاقەتییەوە پرسی:

ئەی لوقمان تۆچی لەم دنیایە دەبینی کە من نایبینم؟

لوقمان دەرکی بەوە دەکرد کە گەورەکەی بە بارودۆخێکدا تێدەپەڕێت کە زۆر خەم بۆ دنیا دەخوات، زۆر بە وردی سەرنجی ڕوخساری دەدا. گەورەکەی هەر چاوەڕێ بو تا بزانێ چی دەڵێت..

لوقمان دەستی بۆ میوەکەی بەردەمی درێژکرد و دەستی کرد بە میوە خواردن، دوای میوە خواردن دوبارە بێدەنگ بووەوە.

گەورەکەی دوبارە بە شێوازێکی زۆر نەرم پرسیارەکەی دوبارەکردەوە، دوای ئەوە بە هۆشیاری و حەکیمانە وەڵامی دایەوە:

گەورەم! دنیا زۆر کەم و بێ نرخە..

-تەمەنی مرۆڤیش تێیدا کەمێکە لەو کەمە..

دوای ماوەیەك لە بێدەنگی گوتی:

تەمەنیشت کەمێکی ماوە لەو کەمی کەمە!

گەورەکەی بەڕێزەوە سەیری دەکرد، توشی شۆك بوبو، پاشان درێژەی

بە قسەکانی داو، گوتی:
دنیات بە دوارۆژت بفرۆشە؛هەردوکیان بەدەست دێنی.
پاشان گوتی:
نەکەی دوارۆژت بە دنیات بفرۆشی، چونکە هەردوکیانت لەدەست دەچن.
گەورەکەی هەر سەری دەلەقاند و زۆر بە وردی سەرنجی لوقمانی دەدا، لەوکاتەدا لوقمان گۆشەنیگای خۆی گۆڕی و لەڕێی پەنجەرەکەوە سەیری دیمەنەکانی پاییزی کرد، لەو کاتەدا گوتی:
گەورەم لەوەتەی هاتویتە دنیاوە ڕووت لە قیامەتە و پشتت لە دنیایە..
گەورەکەی یەکسەر هەستایە سەرپێ و گوتی ئافەرین ئەی لوقمان!
ئەویش درێژەی بە قسەکانیدا:
دنیا دەریایەکی قووڵەو زۆر خەڵك تێیدا خنکاون!
پیاوەکە ڕاستەوخۆ گوتی: ئەدی چی بکەین ئەی لوقمان؟
وەك بڵێی گوێی لە پرسیارەکە نەبوبێ درێژەی بە قسەکانیدا: با تەقوای خوا کەشتیت بێت..
پاشان دوای چەند ساتێك لە بێدەنگی، کە هێشتا هەر لەلای باڵەکۆنەکە وەستابو و گەورەکەی لەدوایەوەبو، گوتی:
-با کاری چاکەش کەلوپەلی ناو کەشتییەکەت بێت.
پیاوەکە ئەوەندە بە وردی سەرنجی دەدا وەك بڵێی دەنکە مرواری لە دەم بێنەدەرێ، ئەویش بەردەوام بو:
--با هەوڵدان بۆ پارێزگاری کردن لە کەلوپەلەکەت قازانجت بێت،
-بەڵێ .
- ڕۆژگار شەپۆلی دەریاکەیە،
بەڵێ.
- کتێبی خواش ڕێنیشاندەرە.

نا فەرین .
- ڕێگری کردنی نەفست لە ئارەزووەکان پەتی ڕزگاریتن.
خوا بتپارێزێ ئەی لوقمان .
- مردن کەناری دەریایە .
بەڵێ .
- قیامەتیش ئەو بازاڕەیە کە تۆ بۆی دەڕۆی .
بەڵێ .
- خواش خاوەنیەتی .
ڕاستدەکەی ئەی لوقمان .
دوای ئەو وتانە ماوەیەك ئارامی و هێمنی لەو شوێنەدا دروستبو، وەك بڵێی بە بێدەنگی ئامۆژگاری خۆی دەکرد..
هەروا بە بێدەنگی مایەوە و تاو نا تاوێك سەیرێکی گەورەکەی دەکرد، کە دوای ئەو هێرشە دەروونییەی توشی بوبو خەریك بو وردە وردە ئارام دەبویەوە و ئەژنۆکانی دەلەرزین و چاوەکانی وردە وردە فرمێسکیان دەباراند، وەك بڵێی داوای لە کۆیلەکە دەکرد مۆڵەتی بدات دابنیشێتەوە و داواش لەو بکات کە دابنیشێتەوەو زیاتر قسەی بۆ بکات.
لوقمان دەرکی بە گرنگی ئەوە دەکرد کە کەسێك داوای ئامۆژگاری بکات و گرنگی ئەو قسانەش کە دەکرێ چارەسەری ئەو کەسە بکات کە بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکات، چونکە ئەو خاوەنیەتی، ئەو بەخێوی دەکات، لەبەر ئەوە کەمێك دەنگی نزم کردەوە و قورگی گیرابو و ئەویش لێی نزیك بووەوەو دەستی گرت تا دابنیشێتەوە .
بەڵام گەورەکەی ڕەتیکردەوە کە پێش ئەو دابنیشێت، لەکاتێکدا ئەو پێشتر داوای لە لوقمان کردبو دابنیشێتەوە، بۆیە لوقمان داواکەی قەبوڵ کرد و پێکەوە دانیشتنەوە، پاشان لە قسەکانی بەردەوام بو:
گەورەم بەدوای دنیادا مەچۆ .

پیاوەکەش بە دەنگێکی نزم دەیگوت:
بەڵێ ئەی لوقمان.
-با دڵیشت وابەستەی دنیا نەبێت، چونکە تۆ بۆ ئەو دروست نەکراوی و خودا هیچ شتێکی لە دنیا بێ نرختر دروست نەکردووە.
سەری دانەواند و خەریك بو فرمێسکەکانی دەسڕی، گوتی:
جا چۆن دەتوانین بەوە بگەین؟
-کاتێك دەرك بەوە دەکەی کە خوا بەخششەکانی وەك پاداشتێك بۆ مرۆڤە چاکەکان دانەناوە و کارەساتەکانیشی وەك سزایەك بۆ مرۆڤە خراپەکان دانەناوە.
پیاوەکە سەری بەرز کردەوە و بە هێواشی پێی گوت:
قسەم بۆ بکە ئەی لوقمان، سوێند بەخوا بە قسەی هیچ کەس ئەوەندە ئاسودە نابم، ئەوەندەی بە قسە ڕەوانەکانی تۆ ئاسودە دەبم.
دڵی لوقمان بە خێرایی لێیدەدا، هەستی دەکرد کە خەریکە یارمەتی پێشکەشی کەسێك دەکات، بەچاوپۆشین لەپێگەی ئەو کەسەی خەریکە قسەی بۆ دەکات، جا دەوڵەمەند بێت یان هەژار،
ئازاد بێت یان کۆیلە،
پاشا بێت یان خزمەتکار،
چ ئەو بچێت بۆلای کەسەکە، یان ئەو کەسە بێت بۆ لای ئەو .
لەکاتێکدا کە بە هێمنی سەرنجی دەدا، پێی گوت:
-گەورەم خۆت هۆگری خەم و خەفەت مەکە.
گەورەکەیشی بەردەوام هانی دەدا، پێی گوت:
بەڵێ ئەی لوقمان.
-دڵت بە خەم و خەفەت سەرقاڵ مەکە.
بەڵێ.
-نەکەی مرۆڤێکی تەماعکار بی.

-نەڵێ هەرگیز.
-بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی بە.
بەڵێ.
-بەو ئەندازەیە ڕازیبە کە خوا بۆتی داناوە گوزەرانت باش دەبێت و ژیانت خۆش دەبێت و ئاسوودەدەبی.
بەڵێ ڕازی دەبم.
-ئەگەر دەتەوێ دەوڵەمەندبی ئەوا چاو لەوە مەبڕە کە هی خەڵکە، چونکە ئەوە سیفەتی پێغەمبەران بووەو گەورەپیاوان بەو سیفەتە بەو پلەیە گەیشتون.
گەورەکەی داوای لێکرد لەو میوە نوێیە بخوات کە خزمەتکارەکان پێش ماوەیەك هێنایانە ژورەوە، وەك بڵێی دەیویست وچانێك بدات، دوای ئەوەی لە میوە خواردن بویەوە و بە پارچە قوماشێکی سپی دەستەکانی سڕی، لێی پرسی:
ئەی لوقمان دەربارەی ماڵ و سامان ئامۆژگاری چیم دەکەی؟
لوقمان کە هێشتا میوەکەی بە تەواوی قوت نەدابو، گوتی:
زێدەڕۆیی مەکە تەنانەت لە بەخشینیشدا،
ڕژد و چاوچنۆکیش مەبە.
پیاوەکە هەر سەری دەلەقاند و بە وردی سەرنجی دەدا.
پاشان گوتی:
ماڵ و سامانت بۆ چاك کردنی بارودۆخی کەسێکی تر بخە گەڕ، چونکە ئەوەی دەیبەخشی سودی بۆت دەبێت و ئەوەی لەدوای خۆت جێی دەهێڵی بۆ کەسێکی تر دەبێت.
هەمو هەوڵێکیشت با بۆ ئەو ئەرکە بێت کە پێت سپێردراوە و کارێك کە پەیوەندی پێتەوە نییە خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە.
* * *

# بەشی سێیەم

لە کاتی نیوەشەودا لوقمان گەڕایەوە جێگاکەی بۆ لای کۆیلەکانی تر تا سەرخەوێك بشکێنێت و بەرەبەیان زو لەخەو هەڵبستێت و لەگەڵ کۆیلەکانی تردا بچێت بۆ دار کۆکردنەوە. ڕۆژێکی نوێی لەبەردەمدا بو تا فێری شتێکی نوێ ببێت لە ژیانیدا کە پێشتر نەیزانیوە..بە وردی سەرنجی درەختی وشکی دەدا. بیری لەوە دەکردەوە کە گەڵاکانی چەند بە ئاسانی دەشکێن و هیچ بەرگری ناکەن، کەچی کاتێك سەوز و تەڕن بە هەمو هێزێکی بەرگری دەکات و مردن ڕەتدەکاتەوە، ئەو بە ژیان وابەستەیەو بە هەمو هێزێکی بەرگری لەوە دەکات کە لە درەختەکەی جیا نەبێتەوە.

بەروبومی تەڕیش بەوپەڕی هێزەوە ڕوبەڕوی ڕەشەبا دەبێتەوە و تا هەر بدرەوشێتەوەو گەڵاکانی برازێنێتەوە، بەڵام کاتێك پێگەیشت خۆی دەکەوێتە خوارەوە، چونکە ئەگەر بە درەختەکەوە بمێنێتەوە خراپی دەکات و ئیتر تر بەر نادات.

ئەی لوقمان بەو جۆرە هەمو شتێك بڕوانە، هەمو شتێك ئەگەر لاوبێت دەکرێ بە ئارەزوی خۆت بیچەمێنیتەوەو مامەڵەی پێبکەی، بەڵام کاتێك تەمەنی زیاد دەبێت ئەگەر بتەوێ بیچەمێنیتەوە دەیشکێنی، یان ئەوەتا دەبێ باجی هەڵەکەت بدەی و بەخواری لەگەڵی هەڵکەی. هەمو شتێك ملکەچی سەردەمی منداڵی دەبێت ئەی لوقمان، هیچ شتێك نییە بە قۆناغی منداڵیدا نەڕوات:

منداڵێتی لە هاوسەرگیری، منداڵێتی لە باوکایەتی، منداڵێتی

دەسەڵات، منداڵێتی دەوڵەمەندی، منداڵێتی هەژاری، منداڵێتی باوەڕ، منداڵێتی بێباوەڕی، منداڵێتی خۆشەویستی، منداڵێتی ڕق و کینە، منداڵێتی هاوڕێیەتی، منداڵێتی ڕکابەرێتی، منداڵێتی گەنجی، منداڵێتی پیری. تێکچونی هەمو ئەو قۆناغانەی منداڵێتی لەبەردەستی خۆتدان، هەرچۆنێك کە بتەوێ وای لێدەکەی و هەر بەو جۆرەش دەمێنێتەوە، هەروەکو هەڵکەندنی نەخش لە بەرد..نەفس ئەوکاتە دەتوانێت بەسەرتدا زاڵ بێت کە بەرگری تۆ بێهێز بێت، ئەوکاتەش کە بەرانبەری بەهێزبی دەتوانی جڵەوگیری بکەی و بیخەیتە ژێر دەستی خۆت.

ئەوکەسەی لەوە سەرکەوتو نابێت کە ببێتە گەورەی نەفسی خۆی، چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت ببێتە گەورەی تاڵەمویەکی خۆیشی چ جای ئەوەی گەورەی کەسانی دی!

هاوڕێ، هیچ دەسەڵاتێك بەر لە بونی دەسەڵات بەسەر ئارەزووەکاندا بونی نییە..

پاشان لەپڕ پەیوەندی نێوان ئاو و درەخت بەشێکی خەیاڵیان داگیرکرد، ئەو ڕوداوەی هاتەوەبیر کە بەر لەساڵێك ڕویدا، کاتێك یەکێك لە کۆیلەکان دەفرێکی پڕ ئاوی لەسەر ئاگری دارەکان لەبیرکردبو، بانگی کۆیلەکەی کرد، پێی گوت:

-براکەم، دەزانی ئاو چی بە ئاگری دارەکان دەڵێت؟!

کۆیلەکە بە سەرسوڕمانەوە ئاوڕی دایەوەو گوتی:

نە بەخوا نازانم!

گوتی: تکای لێدەکات و پێی دەڵێت:

ئەی ئاگر بەزەییت هەبێت، من (تۆ)وەکەتم ئاودا تا بویتە درەختێکی بەهێز، چاکەم بە خراپە وەڵام مەدەوە.

ئەی ئاگر ئەگەر من نەبوایەم تاقە گوڵێکت نەدەگرد،

بولبولێکت لەسەر نەدەنیشتەوە،
پەپولەیەك نێوچاوانتی ماچ نەدەکرد،
هەرگیز نەدەبویتە بوکی بەهار،
ئێستا نەتدەتوانی کارەکەت ئەنجام بدەی و خواردن بۆ مرۆڤە برسییەکان ئامادە بکەی.
ئەی ئاگر بەزەییت هەبێت،
منت سوتاند و لە کۆتاییشدا خۆشت لەناوچوی، ئائەمەیە پاداشتی چاکە؟!
کۆیلەکە بەپەلە هەستا و دەفرەکەی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرت، گوتی ئەی لوقمان: براکەم، سەیرکە بزانە هیچ شتێك لەسەر زەوییەکە نییە نەوەکو بیسوتێنێت، هێواش دایبنێ..زۆر بە هێواشی، خەمت نەبێت ئێستا هەوا بە هانایەوە دێت و کڵپەی ئاگر و گەرمییەکەی دادەمرکێنێتەوە. کاتێك کۆیلەکە ئاوەکەی کوڵاند، بینی ئاوەکە بە هێواشی سەما دەکات و دەبێتە هەڵم و بۆن و بەرامەیەکی خۆش دەدات، سەرپۆشی دەفرەکەش خەریکە دەنگێکی خۆش دەردەکات و دەستدەکات بە ژەنینی ئاوازێکی خۆش.
پاشان لوقمان گوتی: مێهران دەزانی ئاو چی بە ئاگر دەڵێت؟
کۆیلەکەش لەکاتێکدا کە نەیدەتوانی سەرسامییەکەی بشارێتەوە، گوتی:
نەبەخوا نازانم!
گوتی: دەڵێت: تۆ لە کۆتایی ژیانی خۆت و ژیانی من چاکەت لەگەڵدا کردم، هەروەك چۆن من لە سەرەتای ژیانی تۆ و ژیانی خۆم چاکەم لەگەڵدا کردی.
کۆیلەکە وردە وردە لە لوقمان نزیك دەکەوتەوە و هەستی بە سنگ فراوانی ئەو دەکرد و وتەکانی کاریگەرییان لەسەر هەبو.

کوتی: خۆزگە ئازاد بوایەم ئەی لوقمان!
ئەویش گوتی:
ئازادی شتێکی بەرجەستە نییە، دەکرێ لە کوچی زیندانیشدا هەست بە ئازادی بکەی!
لەم بارودۆخەی ئێمەدا بێهیوایی سودێکمان پێنا گەیەنێت، بەر لە هەمو شتێك پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە پێویستە ئێمە شتێك بۆ مرۆڤ و بۆ ژیان بکەین، پاشان بەوەی کە هەمان هەوڵ بۆ ئازادی بدەین کە نیمانە، ئەوکاتە نەوەکانی دوای خۆمان دێن ئەو باڵەخانەیە تەواو دەکەن کە ئێمە خشتی یەکەمیمان داناوە.
هەر لە گفتوگۆکردن بەردەوام بون، لوقمان ئەو دڵەڕاوکێیەی خۆی بۆ باس دەکرد کە بەرانبەر مرۆڤ بە گشتی هەیەتی، ئەو ترسەی کە لەسەر سەرەنجامی نەوەکانی ئاییندە هەیەتی، دەترسا لەوەی پشت لە بەها مرۆڤایەتییەکان بکەن، لەبەر ئەوە دەیویست چوارچێوەی زانیارییەکانی فراوان بکات، دەیویست شتێکی بەسود پێشکەشی خەڵك بکات.
مێهران لە هەمو کاتێکدا هاوڕێی بو، جارێکیان کە خەریکی چنینی بەروبومی درەختەکان بون، لوقمان بەهۆی گەرمی تیشکی خۆر لە هۆش خۆی چو، مێهران هەڵی گرت و خستییە سەر پشتی گوێدرێژێك و گەیاندییەوە شوێنی خەوتنەکەی.
لوقمان دڵی تێکهەڵدەهات و سەری گێژی دەخوارد، بەدەگمەن نەبوایە نانی نەدەخوارد، ئەو پیاوە بەردەوام گرنگی پێدەدا و چاودێری دەکرد، تا دوای مانگێك لە ڕوداوەکە هەواڵەکە گەیشتەوە گەورەکەیان، ئەویش هات سەردانی کرد و لە تەندروستی دڵنیا بویەوە، پاشان دوای چەند ڕۆژێك چەند پزیشکێکی هێنا تا چارەسەری بکەن.
ئەوکات مێهران پێی گوت:

لوقمان، دانایی لەلای گەورەکەمان پلەو پایەیەکی بەرزی پێبەخشیوی.
گوتی:
مرۆڤایەتی بە تەنیا پێویستی بە دانایی نییە، بەڵکو پێویستی بەو کەسانەشە کە گوێ بۆ ئەو داناییە دەگرن و گرنگی پێدەدەن، مرۆڤی دانا بەبێ خەڵك وەك مرۆڤێکی یەك قاچ وایە، خەڵکیش بەبێ دانا وەك مرۆڤێکی یەك قاچ و یەك چاو و یەك گوێ وایە.
شەش مانگ لوقمان لەسەر پشت بو، ئەوکات نرخی ئەو لەش ساغییەی بۆ دەرکەوت کە مرۆڤ هەیەتی و پێویست هەوڵ بدات هەمو چرکەساتێکی ئەو لەش ساغییە لە خزمەت کردن بە خەڵك خەرج بکات، تەنانەت ئەگەر بە لادانی درك و داڵیش بێت لەسەر ڕێگای خەڵك.

* * *

# بەشی چوارەم

لەو کاتەدا کۆیلەیەکی خزمەتکار هات بە لوقمانی گوت کە گەورەکەی گوتویەتی بەیانی زوو بێتەلام و لەگەڵ کۆیلەکاندا نەچێت بۆ دار کۆکردنەوە!!

کەم وا ڕێك کەوتبو گەورەکەی سپێدە زوو بانگی بکات، چونکە ئەو بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستێت و لەگەڵ هاوڕێکانیدا کات بەسەر دەبات، یان بە سواری ئەسپ سەردانی یەکێك لە خزم و دۆستانی دەکات، یان دەچێتە بازاڕی کۆیلەفرۆشان؛ کۆیلەیەك لەگەڵ خۆیدا دەبات بیفرۆشێت، یان کۆیلەیەك دەکڕێت، یان کەنیزەکێك دەکڕێت، یان کەنیزەکێکی نوێ دێنێت.

لەوەتەی قاچی خستۆتە ماڵی گەورەکەی دو جاری دی گەورەکەی لەم کاتانەدا بانگی کردبو، جارێکیان گوتی کە شەوی ڕابردو تا بەیانی نەخەوتوم، بۆ ئەوە بانگی کردبو تا قسەی بۆ بکات تا خەوی لێدەکەوێت، جارێکی تریش بۆ ئەوە بانگی کردبو تا شوێنی زێڕەکەی پێبڵێت چونکە سەفەرێکی دورودرێژی لەبەردەمدابو، پێی گوتبو ئەگەر نەگەڕامەوە ئەو زێڕە بە دادگەری لەنێو هاوسەرەکانم و منداڵەکانمدا دابەش بکە.

ئەوە جاری سێیەمە، تۆ بڵێی ئەو پیاوە چی بەسەرهاتبێت، کە لەو کاتەدا بەدوایدا ناردووە و سەرەڕای چاك بونەوەی لە نەخۆشییەکەی لەگەڵ کۆیلەکاندا نەچێتە دارکۆکردنەوە؟!

مێهران نەیدەتوانی نیگەرانییەکەی بۆ هاوڕێکەی بشارێتەوە، کاتێك

ماڵئاوایی لێدەکرد و ناچاربو لەگەڵ کۆیلەکاندا بچێت بۆ کار، چاوەکانی پڕبون لە فرمێسك و لەباوەشی گرت، لەوە دەترسا کە ئەمە دوا دیداربێت، دوا نیگابێت، دوا قسەیان بێت کە پێی دەگوت:
ئەی لوقمان ئەگەر دوبارە یەکترمان نەبینییەوە لە هەمو ئەو ڕەفتار و گوفتارانەم ببورە کە بەبێ مەبەست لە بەرانبەر تۆدا ئەنجامم دابن..
چاوەکانی لوقمانیش پڕ بوبون لە فرمێسك و دەیگوت:
نا هاوڕێ، تۆ لەمن ببورە ئەگەر شتێکم بەرانبەرت کردبێت و بێزاری کردبیت..
لوقمان هەر سەرنجی مێهرانی دەدا تا لەگەڵ کۆیلەکاندا لەبەر چاو ون بون.
کاتێك خۆر بەرەو ناخی ئاسمان بەرز بووەوە لوقمان بە شێنەیی بەرەولای گەورەکەی بزوت، نەیدەزانی بۆچی ترسی ئەوەی هەیە کە گەورەکەی دەیبات بۆ بازاڕی کۆیلەکان و لەوێ دەیدات بە کۆیلەفرۆشێکی بێ بەزەی، کە مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکات.
لەبەردەم دەرگاکەدا وچانێکی کرد، وەك ئەوەی دوایین جاربێت لەبەردەم ئەو دەرگایە بوەستێت، پاشان دەستی ڕاستی بەرز کردەوە بۆ لەدەرگادان و وەرگرتنی مۆڵەتی چونەژورەوە.
خزمەتکارێگ دەرگاکەی کردەوەو گوتی: وەرە ژورەوە لوقمان گەورەمان چاوەڕێتە.
قاچی خستە ژورەوە، بینی گەورەکەی ڕوخۆشەو پێچەوانەی گومانەکانی دەردەکەوێت..دەرونی فێنك بووەوە، وردە وردە بەرەو ڕوی ڕۆیشت و سڵاوی لێکرد، پیاوەکە لەبەری هەستاو بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد و ڕاستەوخۆ گوتی:
-بۆ ئەوە بانگم کردوی تا تاقیکردنەوەیەکی گەورەی وات بکەم کە ژیانت دەگۆڕێت!

بۆ یەکەمجار بە خەندەوە لەبەردەم گەورەکەیدا بە خەندەوە وەڵامی دایەوە:
-گەورەم لە خوا داواکارم کە یارمەتیم بدات لە ئاست گومانی چاکی تۆدابم.
بە گەرموگوڕی دەستی خستە سەر شانی و گوتی:
-منیش هیوادارم .
پاشان وەك بڵێی بەپەلەبێت ڕاستەوخۆ گوتی:
-ئەی لوقمان، هەر ئێستا برۆ مەڕێك سەرببڕە، خۆشترین دو پارچە گۆشتیم بۆ هەڵبژێرەو بیهێنە بۆم.
لوقمان توشی شۆك بو، هەرگیز چاوەڕێی داواکارییەکی وای لە گەورەکەی نەدەکرد..
دوای کەمێك لە وەستان لە بەردەم گەورەکەیدا، کە هێشتا هەر بەپێوەبو، گوێڕایەڵی خۆی ڕاگەیاند و گوتی:
-بەسەرچاو گەورەم .
ڕۆیشت، خەیاڵی لەلای ئەو وشە کاریگەرانەبو، کە ئەم بەیانییە گوێی لێ بوبون؛ تۆ بڵێی ئەو تاقیکرنەوەیە چی بێت کە ژیانی دەگۆڕێت، ئایا لایەنە چاکەکە دەگۆڕێت یان خراپەکە؟!
تۆ بڵێی ناوەڕۆکی ئەو گۆڕانە چی بێت، کە زۆر بەگرنگی باسی لێوە کرد و دوپاتی کردەوە، تۆبڵێی ئەو گۆڕانکارییە چی بێت کە بەسەر کۆیلەیەکدادێت کە هیچ شك نابات؟!
چی تر کاتی بەفیڕۆ نەدا، ڕاستەوخۆ بەرەو شوێنی مەڕەکان چو و مەڕێکی هەڵبژارد و سەری بڕی و بڕژاندی..
کاتی نانی نیوەڕۆ هات، وەك ئەوەی لە تاقیکردنەوەدابێت ڕاستەخۆ دو پارچەی هەڵبژاردن.
دوبارە بەرەو هەمان دەرگا ڕۆیشت، زۆر دەترسا، وەك ئەوەی یەکەمین

جاری بێت بەو دەرگایەدا دەچێتە ژورەوە، وەك ئەوەی یەکەمین جاری بێت گەورەکەی دەبینێت!

کاتێك گەیشتە بەردەم دەرگاکە، خزمەتکارەکە بانگی کرد:

وەرە ژورەوە لوقمان، گەورەمان چاوەڕێی ئەوەیە کە فەرمانی پێکردبوی.

بەهێواشی بەرەو ژورەوە هەنگاوی نا، زۆر دڵتەنگ بو وەك ئەوەی بەرەو قوڵایی بیرێك دەچێت.

بەهێواشی لە بەردەم گەورەکەیدا وەستا، هەردو پارچە گۆشتەکەی لەناو قاپێکدا دانابون و بە پەڕۆیەکی گوڵ ڕەنگ داپۆشیبون.

کاتێك گەورەکەی چاوی پێکەوت هەستایە سەرپێ، زۆر تامەزرۆبو تا ئەو دو چاکترین پارچە گۆشتەی مەڕ ببینێت و ژەمێکی بەتام بخوات.

گوتی:

- ئەوەی فەرمانم پێکردبوی ئەنجامتدا؟

لەکاتێکدا بە وردی چاوی لەسەر قاپەکە بو، وەك ئەوەی گەنجینەیەکی گرانبەها بێت، گوتی:

هەروەك فەرمانت کردبو گەورەم.

گەورەکەی سەیری قاپەکەی کرد و پێی گوت:

- سەرپۆشەکە لادە..

قاپەکەی لەسەر مێزەکە دانا، دەستی بۆ پەڕۆکە درێژکرد تا لایبدات..

گەورەکەی زۆر بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێ بو.

وردە وردە پارچە پەڕۆکەی لادا، زمان و دڵ دەرکەوتن کە لە قوڵایی قاپەکەدا لەسەر پارچە نانێکی ساجی دانرابون.

ژەمەکەی پێشکەشی گەورەکەی کرد و گوتی:

- مەڕەکە لەو دو پارچە گۆشتە چاکتری تێدا نەبو گەورەم .

پیاوەکە سەری لەقاند و بێئەوەی هیچ قسەیەك بکات بەدەستی

ناماژەی کرد کە قاپەکە جێبهێڵێت و بڕوات.
گەڕایەوە ژورە چۆڵەکەی، لەسەر پشتی پاڵکەوت و سەری خستە سەر هەردو دەستە لێك گرێدراوەکانی.

لەلای خۆشیەوە مێهران زۆر بۆ هاوڕێکەی نیگەران بو، وایدەزانی کە نایبینێتەوە.

لە ئێوارەدا کاتێك کۆیلەکان گەڕانەوە، مێهران لە پێشیانەوە دەڕۆیشت، هەر دوعای دەکرد لوقمان ببینێتەوە، لەو ساتانەدا لوقمان لەبەردەم دەرگا وەستابو، چاوەڕێی هاوڕێکەی دەکرد، لەو کاتەدا هەردو هاوڕێ وەك ئەوەی ماوەیەکی دورودرێژبێت یەکتریان نەدیبێ بەرەو لای یەکتر ڕایانکرد و باوەشیان بەیەکترداکرد، کۆیلەکان سەریان سوڕمابو، پاشان ئەوانیش یەك لەدوای یەك لوقمانیان لەباوەش گرت.

کۆیلەکان پرسیاریان لێکرد کە چی قەوماوە، بەڵام ئەو هیچ قسەی نەکرد، لە نیوەشەودا مێهران دەربارەی هۆکاری چونی بۆلای گەورەکەی پرسیاری لێکرد.

ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بو، تەنانەت پیتێکیشی لە دەم دەرنەچو، ئەوکاتە مێهران زانی کە نایەوێت قسە بکات .

لە هەمو لایەکەوە بیرۆکەی جۆراوجۆری بە مێشکدا دەهاتن.

لوقمان هەر چاوەڕێی هەڵوێستی گەورەکەی بو، دەربارەی ئەو تاقیکردنەوەیەی کە باسی دەکرد و دەربارەی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی کە بەسەر ژیانیدا دێت.

زۆربەی شەوان تا بەرەبەیان هەر بێدار بو.

مێهران نیشانەی ترس و دڵەڕاوکێی لە هاوڕێکەیدا بەدیدەکرد، چونکە کەمی دەخوارد و کەم دەخەوت.

هەرچەندە مێهران ئەوی هەر بە گۆشەگیری ناسیوە، بەڵام ئێستا زۆر لە جاران گۆشەگیرترە.

لە شەودا کاتێك کۆیلەکان نوقمی خەو دەبون دوای گەڕانەوەیان لە کاری قورس، لوقمان لەگەڵ خۆیدا دەکەوتە گفتوگۆ:
تۆبڵێی لەو تاقیکردنەوەیە سەرکەوتونەبویی، ئایا لەکاتی قسەکردندا ڕەفتارێکی نەشیاوت بەرانبەر بە گەورەکەت نەکردووە، ئایا لە بەردەمیدا بیرت چو کە تۆ کۆیلەی و ئەویش گەورە و خاوەنی تۆ و ئازادییەکەتە، ئایا ئەو پێشوازییە گەرمەی وای لێکردی سنوری کۆیلایەتی تێبپەڕێنی، تۆبڵێی بتبات بۆ بازاڕی کۆیلەکان و وەك سزایەك بە بازرگانێکی دڵڕەقی بێ بەزەیی بتفرۆشێت؟
بیرەوەرییەکانی لەگەڵ گەورەکەیدا دەهاتنەوەیاد، ئەو ڕۆژەی دانایی خۆی بۆ گەورەکەی سەلماند، ئەوڕۆژەی گەورەکەی بەچاوی سەرسامییەوە سەیری دەکرد و شانازی دەکرد کە کۆیلەیەکی وا دانا و کاربەجێی هەیە.
ئەو ڕۆژەی گەورەکەی لەگەڵ هاوڕێیەکی زۆری خواردبویەوەو لە کاتی سەرخۆشیدا لەگەڵ هاوڕێکانیدا گرەوی ئەوەی کردبو کە دەتوانێت هەمو ئاوە دەریاچەکەی نزیك خۆیان دەخواتەوە.
ئەگەر نەیشی توانی ئەوا هەرچی هەیەتی تەنانەت کۆیلەکان و مەڕومالاتەکەشیان پێدەدات، خۆ ئەگەر توانی ئەوا بەقەد ئەوەی کە هەیەتی لە کۆیلەو مەڕومالات پێی دەدەن.
سپێدەی ڕۆژی دواتر کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانی کە بۆ ئەنجامدانی گرەوەکە شەو لەلای مابونەوە لەخەو هەستا، ئەوکاتە کاریگەری خواردنەوەکەی بەسەرەوە نەمابو، بۆیە هەستی بە مەترسی ئەو هەڵوێستە دەکرد کە تێی کەوتبو، چۆن دەتوانێ ئاوی دەریاچەیەك بخواتەوە؟! بۆیە لەدوای ئەو کۆیلەیەی نارد کە بە دانایی بەناوبانگە، داوای لێکرد هەمو زیرەکی خۆی بەکاربێنێت تا ماڵ و سامانەکەی ڕزگار بکات و لەو کێشەیە دەربازی بکات.

گەورەکەی بە لوقمانی دەگوت: من بۆ ڕۆژێکی ئاوا تۆم هەڵگرتووە. لوقمان گوتی پێویستیم بە هەندێ کات هەیە تا بیر لە ڕێگا چارەیەك دەکەمەوە، لە نیوەڕۆدا دیم ڕێگا چارەکەم دەخەمەڕو.

دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆیان خوارد، لوقمان هاتە ژوورەوە، گەورەکەی بە میوانەکانی گوت:

- لەسەر چی گرەومان کرد؟

گوتیان:

- لەسەر خواردنەوەی ئاوی ئەم دەریاچەیە!

ئەوکاتە لوقمان گوتی:

- بەڵام دەریاچەکە لە هەموو لایەکەوە بە جۆگا ئاوی دەڕژێتە ناو!

پاشان گوتی:

- ئێوە ئەگەر دەتوانن هەموو جۆگاکان ببڕن، با ئەویش ئاوەکە بخواتەوە!

ئەوانیش بە سەرسامییەوە گوتیان:

- چۆن دەتوانین ئەو هەموو جۆگایە ببڕین؟!

لوقمانیش گوتی:

- ئەدی ئەو چۆن دەتوانێت ئاوەکە بخواتەوە و لە جۆگاکانیشەوە بەردەوام ئاوی بڕژێتە ناو؟!

ئەوانیش نەیانتوانی هیچ بڵێن، بەمەش لوقمان گەورەکەی ڕزگارکرد.

لەو ڕۆژەوە ناوبانگی لوقمان بەوە بڵاو بووەوە کە توانیویەتی گەورەکەی ڕزگار بکات.

دوای بیست و دو ڕۆژ لە چاوەڕوانی و دڵەڕاوکێ، بەر لە ڕۆیشتنی بۆ سەر کار، وەك جاری پێشو و لەهەمان کاتدا بانگی کرد.

وەك ئەوەی چیایەك لەسەر شانی بوبێت و لاچوبێت، بۆ یەکەمجار دوای ئەو بەیانییە هەناسەی ئاسودەیی هەڵکێشا.

دوای ڕۆیشتنی کۆیلەکان بۆ سەرکار هەستی کرد کە پێویستی بەوەیە

کەمێك بە تەنیا لەگەڵ خۆیدا دانیشێت، مێهرانی هاوڕێشی لە جاری پێشو کەمتر نیگەران بو، چونکە وای هەستدەکرد کە بۆ ڕاوێژ پێکردن بەدوایدا ناردووە.
ماوەیەك بە تەنیا دانیشت، بیری لە هەمو شتێك کردەوە کە دەکرێ پێی بڵێت و دوای ماوەیەك هەستیکرد کە ئامادەیە بۆبیستنی هەر هەواڵێك.
بەرەو ژوری گەورەکەی کەوتەڕێ..
کاتێك لە دەرگاکە نزیك بووەوە، بینی چەند کەسێکی نامۆ بە هێواشی بەرەو لای گەورەکەی دەکشێن، لەو کاتەدا یەکێك لە خزمەتکارەکان هات و پێی گوت کە گەورەکەی دیداری ئەوی بۆ کاتێکی تر دواخستووە.
لوقمان نەیویست ئەو ڕۆژە بە تەنیا و لەژێر باری بیرکردنەوە بباتەسەر، بۆیە ڕاستەوخۆ بەرەو شوێنی دارکۆکردنەوە بۆلای هاوڕێکانی ڕۆیشت.
کۆیلەکان چاوەڕێ بون بگەڕێنەوە تا هەواڵی لوقمان بزانن، بەڵام کاتێك لوقمانیان لەنێو خۆیاندا بینیەوە زۆر خۆشحاڵ بون .
لوقمان پێی گوتن کە گەورەیان میوانی هاتووە و دیدارەکەی بۆ کاتێکی تر دواخستووە.
مێهران زۆر بە گەیشتنی هاوڕێکەی دڵخۆش بو و دەستی گرت و جیای کردەوە تا پێکەوە بە تەنیا خەریکی کارکردن بن.
گوتی:
- خۆزگە دەمزانی گەورەمان چ نیازێکی هەیە لوقمان.
وەڵامی دایەوە:
-بە دڵنیاییەوە نیازی پاکە هاوڕێ.
گوتی:
- تۆ وا بیردەکەیەوە؟
وەڵامی دایەوە:

- له خوا داواکارم وابێت .
ئێواره که گه‌ڕانه‌وه خزمه‌تکارێك پێ گوت، که گه‌وره‌که‌ی چه‌ند میوانێکی زۆ خۆشه‌ویستی هه‌یه‌و پێویسته نانی ئێواره ئاماده بکات، چونکه ئه‌و به ئاماده‌کردنی خواردنی خۆش ناسرابو .
شه‌ش ڕۆژ به‌سه‌ر ڕۆیشتنی میوانه‌کاندا تێپه‌ڕی، لوقمان هه‌مو ساتێك چاوه‌ڕێ بو گه‌وره‌که‌ی بانگی بکات، بۆیه شه‌وێکیان ئه‌وه‌ی به‌بیردا هات، که ده‌کرێ ئه‌و پیاوه ئه‌و کاره‌ی بیرچوبێته‌وه، بۆیه وای به‌باشی زانی که به یه‌کێك له خزمه‌تکاره‌کان بڵێت که بیری بخاته‌وه، به‌ڵام ئه‌و له کۆتاییدا چاوه‌ڕوانی هه‌ڵبژارد تا کاتی ته‌واوبونی کۆژانه‌کانی دێت .
له سپێده‌ی ڕۆژی حه‌وته‌م، ئه‌و خزمه‌تکاره‌ی تایبه‌ت بو به‌و کاره هاته ژوری کۆیله‌کان، به لوقمانی ڕاگه‌یاند که گه‌وره‌که‌ی گوتویه‌تی هه‌ر ئێستا بێت .
خۆی ئاماده‌کرد و دوای ماوه‌یه‌ك به‌ره‌و لای ئه‌و که‌سه ڕۆیشت که بڕیاری ژیانی به‌ده‌سته.
کاتێك له‌لای گه‌وره‌که‌ی دانیشت، گه‌وره‌که‌ی ڕاسته‌وخۆ پێی گوت:
- ئه‌وه چیته نه‌خۆشی لوقمان؟
به متمانه‌وه وه‌ڵامی دایه‌وه:
نه‌خێر گه‌وره‌م..
گوتی:
- نه‌خۆش دیاری، ئه‌گه‌ر نه‌خۆشی با چاره‌سه‌رت بۆ بکه‌ین. تۆ پێگه‌ی خۆت له‌لای من ده‌زانی.
ئه‌و قسه‌یه زۆر ئاسوده‌ی کرد، خۆی نه‌گرت و فرمێسك به چاوه‌کانیدا هاتنه خواره‌وه، ئه‌وکاته گه‌وره‌که‌ی گوتی:
- جاری پێشو داوام لێکردی که مه‌ڕێك سه‌ر ببڕی و دو خۆشترین

پارچە گۆشتەکانیم بۆ بهێنی.
گوتی:
- بەڵێ گەورەم .
گوتی:
- ئەمڕۆ داوات لێدەکەم کە مەڕێکی تر سەر ببڕی و دو خراپترین و پیسترین پارچە گۆشتەکانیم بۆ بێنی !
جارێکی دی لوقمان لە شوێنی خۆی ڕەق بو، وەك ئەوەی بروسك لێیدابێت .
پیاوەکە گوتی:
- تێگەیشتی یان دوبارەی بکەمەوە؟
سەری دانەواند و گوتی:
-نا گەورەم، باش تێگەیشتم، بەسەرچاو .
ڕۆیشتە دەرەوە، بیری دەکردەوە، تۆبڵێی گەورەکەی لە پشت ئەو داواکارییە سەیرە چ مەبەستێکی هەبێت؟
ئێستا لەسەری پێویستە زو کارەکەی ئەنجام بدات، گەورەکەی چاوەڕێیە .
جارێکی تر چووەوە شوێنی مەڕەکان و ملی یەکێکی گرت و دوای کاتژمێرێك گەڕایەوە لای گەورەکەی و پێی گوت:
- گەورەم خراپترین دو پارچە گۆشتم بۆ هێنای.
گوتی:
چی و چیت هێناون؟
گوتی:
- زمان و دڵ !
توشی سەرسوڕمان بو، گوتی:
- فەرمانم پێکردی باشترین دو پارچە گۆشتم بۆ بێنی؛ زمان و دڵت

بۆ هێنام، فەرمانم پێکردی خراپترین دو پارچە گۆشتم بۆ بێنی زمان و دڵت بۆ هێنام !!

لوقمان گوتی:

- گەورەم، ئەگەر ئەو دووانە چاك بن لە هەمو شتێك چاکترن، ئەگەر خراپیش بن لە هەمو شتێك خراپترن .

پیاوەکە بۆ ماوەیەك سەرنجی قسەکەی دا، پاشان لێی نزیك بووەوە و دەستی خستە سەرشانی و پێی گوت:

- ئەی لوقمان، برۆ، تۆ ئازادی، شەرمەزارییە بۆ من تۆ بە کۆیلە لەلای خۆم یان لەلای کەسێکی تر بهێڵمەوە، تۆ خزمەتی وات پێشکەشی من کردووە کە بە پارەو سامان بەراورد ناکرێ .

ئەو قسانە، بە نرخترین قسەبون، کە لە گەورەکەی بیستبێتی، ئەو وشانە بۆ هەمیشە لە بیریدا دەمێننەوە، ئەو وشانە دەبنە پریشکی هەڵگیرسانی شۆڕشێکی نوێ لە ژیانیدا و کرانەوەی دەرگای هیوا بەرەو ئاسۆی ڕونی ژیان.

بە نیگاکانی گەورەکەی لە ئامێز دەگرت، لەکاتێکدا چاوەکانی پڕ بوبون لە فرمێسك.

جاری یەکەمە دەبینێت گەورەکەی دەگری، ئەو گەورە توند و قسەڕەقە بەرانبەر کۆیلەیەك دەگری! دەیگوت گریانەکەی گریانی خۆشییە بۆ ئازادی ئەو و گریانی ناخۆشییە بۆ جیابونەوە لێی.

لوقمان دەستیکردەوە بە قسەکردن لەگەڵ خۆیدا:

بەڵێ ئەی لوقمان، بەئەندازەی ئەوەی کە قەرزاری ئەو پیاوە بەخشندەیەی کە لە کۆیلەیی ڕزگاری کردی، ئەوەندەش قەرزاری دانایی .

پێشتر تۆ تەنیا داناییت هەبو، بەڵام ئێستا دانایی و ئازادیت هەیە، ئەو ئازادییەی کە پێویستە هەمو ساتێکی بە هەل بزانی بۆ چەسپاندنی

دانایی لەسەر خۆت و بەکارخستنی بۆ خزمەتی خەڵك.
بەرپرسیاریەتی ئازادی زۆر گەورەیە، بۆیە بە وردی سەرنج بدە، هەر هەنگاوێك کە دەینێی، هەر وشەیەك کە دەیڵێی، هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەی..ئێستا تۆ ئازادی !
پیاوەکە داوای لێکرد کە لە تەنیشتییەوە دابنیشێت، پێی دەگوت کە ئەو ئێستا لەو کەمتر نییەو پێویستە وشەی (گەورەم) لە یاد بکات، ئازادی هات و ئەو وشەیەی هەڵیوەشاندەوە.
پاشان گوتی:
- ئەی لوقمان من دەمەوێ بەر لەماڵئاوایی چەند وتەیەکی گرنگم پێبڵێی.
لوقمان لە تەنیشتییەوە دانیشت و گوتی:
- لە پەروەردگار داواکارم چاکە بخاتە سەر زمانم و تۆش سودی لێوەربگری.
گوتی:
ئەی لوقمان من زۆر ڕەوشتی جوانم لە وتە جوانەکانی تۆ وەرگرتووە، ئەگەر تۆ نەبای نەدەبون !
لوقمان گوتی:
-ئامۆژگاریت دەکەم بە پێنج شت:
پیاوەکە بە دەنگێکی نزم گوتی:
- ئامۆژگاریم بکە ئەی لوقمان.
گوتی:
یەکەم: زۆر خۆت بە دنیاوە خەریك مەکە، تەنیا حسابی ئەو تەمەنە کەمە بکە کە ماوتە.
دووەم: بە ئەندازەی پێویستیت بە پەروەردگارت خواپەرستی بکە.
سێیەم: با هەمو کارێکت بۆ ڕزگاربون بێت لە ئاگر.

چوارەم: بە ئەندازەی ئارامگرتنت بەرانبەر بە سزای خوا لەسەر تاوان ئارام بگرە.
پێنجەم: ئەگەر ویستت تاوان بکەی، شوێنێك بدۆزەرەوە كە خواو فریشتەكان نەتبینن !
پیاوەكە چاوی لێكنابون و سەری دەلەقاند.
پاشان لوقمان گوتی:
- دو ئامۆژگاریت دەكەم تا ئەوكاتەی دەستیان پێوەدەگری لە پاشیدای: سامانت بۆ ژیانت، ئایینت بۆ دوارۆژت .
پیاوەكە بەچاكی گوێی گرتووەو داوای زیاتر دەكات..
لوقمان كەمێك بێدەنگ دەبێت، پاشان دەڵێت:
- تورِەییت بە ئارامی سەركوت بكە، ئارەزوشت بە تەقوا.
پاشان دەڵێت:
- لە تەنگانەدا هێمن بە. لە ناخۆشیدا ئارام بە..
لەخۆشیدا سوپاسگوزار بە..لە نوێژدا هۆشیار بە..لە بەخشیندا بەپەلەبە.
كاتێك لە نوێژدابوی دڵت بپارێزە،
كاتێك لەسەر خواردن بوی گەدەت بپارێزە،
كاتێك لە ماڵی كەسێك بوی چاوت بپارێزە،
كاتێك لەناو خەڵكدا بوی زمانت بپارێزە.
دو شت لەبیر مەكەو دو شت لەبیر بكە:
ئەو دو شتەی كە پێویستە لەیادیان نەكەی: خوا و مردنن .
هەرچی ئەو دو شتانەن كە پێویستە لەیادیان بكەی: چاكەت لەگەڵ خەڵك و خراپەی خەڵك لە بەرانبەرت.

* * *

# بەشی پێنجەم

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر پیاوەکە بۆ نان خواردن بەبۆنەی ئازادی لوقمان بانگهێشتی هەمو خەڵکی ناوچەکەی کرد.
هەر لە کاتژمێرەکانی سەرەتای ڕۆژەکە شایی و هەڵپەڕکێ و دەهۆڵ کوتان دەستی پێکرد و خەڵکی ناوچەکە و تەنانەت کۆیلەکانیش بەشدار بون.
مێهران کە فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارێ گوتی:
- لوقمان من بە ئازادی تۆ زۆر خۆشحاڵم، بەڵام بۆ جیابونەوەت زۆر خەمبارم، ئەگەرچی خۆشحاڵییەکەم زیاترە، لە خوا داواکارم لە ژیانی نوێتدا سەرکەوتوت بکات.
لوقمان گوتی:
- منیش لە خوا داواکارم چاکەت بۆ بێنێتەڕێ.
لە گۆشەیەکدا ئافرەتان دەوریان لە تەردەستێك دابو، کە جموجۆڵی سەیروسەمەرەی دەکرد، دەمێك کەمەری بە جموجۆڵی پێکەنیناوی دەجوڵاند، دەمێك ڕایدەکرد، بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش بازی دەدا، بە هاندانی ئافرەتەکان گەرموگوڕتر دەبو.
مرۆڤ بونەوەرێکە مەیلی دۆزینەوەو تاقیکردنەوەی شێوازی نوێ و جۆراوجۆر دەکات، زۆرجاریش ئەو مەبەستەی بە جوڵە نەك بەگوفتار باشتر بۆ ئەنجام دەدرێ .
لوقمان لەڕاستیدا ئەو ڕەفتارانە زمانی بێ وشەن، مرۆڤ دەتوانێ لەڕێی نیگای چاوەکانی گوزارشت لە زۆر شت بکات، یان لە ڕێگەی

جوڵەی لێوەکانی، یان برۆکانی یان دەم و ددانی، تەنانەت خەندەش هەوڵێکە بۆ دەربڕین و بەشداریکردن لە ڕووداوێك بەبێ وشە، هەروەك چۆن گریانیش هەمان واتای هەیە.

لەوانەیە هەندێ جار مرۆڤ بۆ دەربڕینی ڕازیبون یان ڕازی نەبون پەنا بباتە بەر بێدەنگی، هەروەك چۆن کچ کاتێك داخوازی دەکرێ بۆ دەربڕینی ڕازی بون یان ڕازی نەبون بێدەنگی هەڵدەبژێرێ و لەڕێی جوڵەی دەموچاوی هەستی پێدەکرێ، یان ئەوەتا بە شێوازێکی تری دەربڕین وەك سەر لەقاندن و ڕۆشتنە ژورەکەی.

هەروەها مرۆڤ دەتوانێ لەڕێگەی جوڵاندنی سەری گوزارشت لە زۆر شت بکات؛ بۆ نمونە جوڵاندنی بۆ خوارەوە وەك ڕازیبون و بەرزکردنەوەی برۆکانی وەك ئاماژە بۆ ڕەتکردنەوە.

هەروەها مرۆڤ توانیویەتی ئامێری وا دروست بکات، کە دەنگی لێدەربچێت و گوزارشت لە خۆشی و ناخۆشییەکانی بکات و وای لێبکات سەما بکات، یان بگری .

جوڵاندنی دەست گوزارشتە لە سڵاوکردن، هەروەك چۆن دەکرێ گوزارشت بێت لە ماڵئاوایی کردن.

ئا ئەوەیە ژیان لوقمان، پێویستە لەناویدا بتوێیتەوە تا بتوانی لەگەڵیدا هەڵکەی و لە نهێنییەکانی تێبگەی.

بەڵام بیرت نەچێت کە ئێستا سەماو دڵخۆشی ئەو خەڵکە دەبینی ئەوە گوزارشتە لە خۆشحاڵییان بۆ ئازادی تۆ..

ئێستا. تۆ ئازادی.

تۆ ئێستا لە تەمەنی پەنجا ساڵیتدا لە هەمو کاتێك زیاتر دەرك بە نرخی ئازادی دەکەی.

ئێستا دەزانی کە کۆیلایەتی زیندانەو ئازادیش ئاسۆیەکی کراوەیە.

ئێستا هەست بەوە دەکەی کە ناخۆشترین هەست بۆ مرۆڤ ئەوەیە

خاوەنی خۆی نەبێت و وەك ئاژەڵ لغاو بکرێت و بیەوێ یا نەیەوێ بۆ هەمو شوێنێك ببرێت.

ئێستا هەست بەوە دەکەی کە خۆشترین هەست بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە خاوەنی خۆی بێت و ئازاد بێت بە چ ئاراستەیەك هەنگاو دەنێت .

کاتێك ئازادبی بە ئارەزوی خۆت ڕەفتار دەکەی، بەڵام کە کۆیلەبی بە ئارەزوی گەورەکەت ڕەفتار دەکەی .

ئەی لوقمان ئەوە بزانە کە کۆیلەیی تەنیا بۆ گەورە و خاوەن نییە، زۆر مرۆڤ هەن ئازادن بەڵام کۆیلەن، کۆیلەی ئارەزو، کۆیلەی ماڵ و سامان، کۆیلەی خراپە و خراپەکاری دەرونیان..

کاتێك مرۆڤ خاوەنی خۆی نەبێت خاوەنی هیچ نییە، کاتێکیش خاوەنی خۆی بێت خاوەنی هەمو شتێکە.

دوای سەرنجدانێکی قوڵ لە لاپەڕەکانی ژیانی ئاییندەی، لوقمان بڕیاریدا لەو شوێنە دوربکەوێتەوە کە تێیدا کۆیلە بووە.

وای بەباش زانی کە لەو کەش و هەوایە دوربکەوێتەوە و بەرەو زەمینێکی تر بڕوات کە نەیدیبێت.

لەوێ دەتوانێت پلان بۆ ژیانی ئاییندەی دابنێت و ئازادی خۆی بە تەواوی هەست پێبکات و بەرپرس بێت لە ژیانی خۆی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانی دەوروبەری.

گەورەکەیان مۆڵەتی سێ ڕۆژی دایە کۆیلەکان تا ماڵئاوایی لە لوقمان بکەن، لەو سێ ڕۆژەدا کۆیلەکان نەچونە سەر کار، لوقمان تا ئێواران لەلایان دەبو، پاشان دەچووە لای گەورەکەی و تا درەنگانی شەو پێکەوە دادەنیشتن و شەویش هەر لەوێ دەخەوت.

کاتی ماڵئاوایی هات، لوقمان بە گەرموگوڕی ماڵئاوایی لە گەورەکەی کرد، پاشان یەکە بە یەکە ماڵئاوایی لە کۆیلەو کەنیزەکەکان کرد، پاشان چووە لای مێهران و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ماڵئاوایی لێکرد.

سواری ئەو ئەسپە بوو کە گەورەکەی پێشکەشی کردبو، پاشان بەبێ ئەوەی هیچ پلانێکی هەبێت بەرەو شوێنێکی نادیار دورکەوتەوە.
دورکەوتەوە، یەکەمین جار بوو شنەبای ئازادی هەڵمژێت، یەکەمین جار هەست بکات کەس بە دوایەوە نییە، هەستی دەکرد کە ئەو پەتە ئەستورەی پساندووە کە پێی بەند کرابو، ئەو پەتەی لە دەستی گەورەکەی دابو.
ئێستا بێ کۆت و بەند و ئازادانە هەنگاو دەنێت، ئەمەش لە بەخشندەیی خوا دەزانێت و لە هەر هەنگاوێك ئەمەی بیر دەکەوێتەوە.
دوای دە ڕۆژ ڕۆیشتن لە شوێنێکدا نیشتەجێ بو، کە هەستی کرد ئەوێ بۆی گونجاوە و خەڵکەکەی مرۆڤی باشن.
چەند ڕۆژێك لەناو ئەو خەڵکەدا مایەوە کە یەکەم جار بو بیان بینێت، بازرگانێکی مەڕومالاتی ناسی، دوای ماوەیەك داوای لە لوقمان کرد شوانەتی بۆ بکات.
ئەمە یەکەمین هەلیەتی بۆ دەستکەوتنی سامان و خشتەی یەکەم بۆ بنیاتنانی ژیانێکی پڕ لە شکۆمەندی .
سواری گوێدرێژێك بو و بەرەو زەمینی پان و پۆڕ بۆ لەوەڕاندنی سێسەد سەر مەڕ لە ناو بیابان و دەشت و دۆڵ، لەو کاتانەدا هەستی بە گەورەیی ژیان دەکرد.
جاری یەکەمی بو هەست بەوە بکات کە ئەو خۆی بەرپرسە لە ژیانی خۆی و تاکێکی کۆمەڵە و دەبێ خزمەتێکی کۆمەڵگا بکات.
دوای تێپەڕبونی دە ساڵ بەسەر کارەکەیدا و دوای کڕینی خانویەك، وای بە باش زانی کە ماوەیەك پشو بدات و بەدوای هاوسەری ژیانیدا بگەڕێت، کەسێك کە یەکتریان خۆش بوێت و خێزانێك پێك بهێنێت و مندالی ببێت..
ماوەیەك دەستی لە کارەکەی هەڵگرت تا بیر لەو کارانەی بکاتەوە کە

لە سەردەمی ئازادیدا ئەنجامی داون، پاشان دەست بکات بە گەڕان بەدوای ئافرەتێکدا.
لە خانووەکەیدا لەسەر پشت پاڵکەوت، چێژی لە خاوەندارێتی وەردەگرت.
ئەو ئێستا خاوەن خانو و مەڕوماڵات و سامان و خاوەن کاتی خۆیەتی..
ئەگەر خوێن گەرمی خۆت نەبوایە نەتدەتوانی ببیتە خاوەنی ئەم شتانە.
ئێستا کەس ناتوانێت بێزارت بکات، گۆمی ڕونی ژیانت شلوێ بکات.
چەندساڵێك کارکردن بونە هۆی ئەوەی خودا لە دەست پانکردنەوە لە بەردەم خەڵك ڕزگارت بکات.
ئێستا تۆ گەورەی خۆتی،
گەورەی ماڵەوەی،
خاوەنی مەڕوماڵاتەکەتی،
خاوەنی کاتی خۆتی .
تەنانەت بۆ ساتێکیش ئەوەت لەیاد نەچێت کە سوپاسگوزاری خوا بکەی لەسەر ئەوەی کە گەورەکەتی هیدایەتدا تا ئازادیت پێببەخشێت، لەیادت نەچێت بەردەوام سوپاسگوزاری خوا بکەی لەسەر ئەو داناییەی پێی بەخشیوی، ئەو داناییەی ئەگەر نەبوایە تۆ بە هیچ شتێکی تر لە هاوڕێکانت جیا نەدەبویت، بەمەش بەکۆیلەیی دەژی و هەر بە کۆیلەییش دەمری.

* * *

# بەشی شەشەم

لە گەرمای نیوەڕۆدا لەسەر پشت پاڵکەوتبو، بەهۆی دەنگێکی نامۆوە کە پێشتر بەر گوێی نەکەوتبو خەبەری بووەوە، بانگکرا: ئەی لوقمان...؟!
چاوەکانی کردنەوە تا دڵنیا بێت کە خەون نییە، دوبارە بانگ کرایەوە: ئەی لوقمان دەتەوێ خوا بتکاتە جێنشین لەسەر زەوی و بە دادگەری حوکم لەنێوان خەڵکیدا بکەی؟
هەستایە سەر ئەژنۆ، توشی خشوعێکی زۆر بو، دەیزانی کە ئەو دەنگە چاوەڕێی وەڵامی ئەو دەکات .
لەترسا دەلەرزی، ترپەی دڵی بەخێرایی لێیدەدا، توشی (تا)یەکی قورس بو، هەر دەیگوت: ئەگەر خوا ڕێگام پێبدات سەلامەتی هەڵدەبژێرم و خۆم لە قەرەی ئەو کارە گەورەیە نادەم..
دەنگەکە کپ بو، لوقمان درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام ئەگەر فەرمان بێت گوێڕایەڵ دەبم، چونکە دەزانم ئەگەر فەرمانی ئەو بێت یارمەتیم دەدات و دەمپارێزێت .
دوای بێدەنگییەکی سامناك، دەنگەکە هاتەوە: بۆچی ئەی لوقمان؟
گوتی: چونکە حوکم و دادگەری لە هەمو کارێك قورسترە و لە هەمولایەك ستەم دەوریداوە.
دادوەر ئەگەر بپێکێت ئەگەری دەربازبونی هەیە، بەڵام ئەگەر لە حوکمدا هەڵە بکات ئەوا ڕێگای بەهەشت ون دەکات، هەر کەسێکیش لە دنیادا زەلیل بێت بەڵام لە دوارۆژدا سەر بەرز بێت، باشترە لەوەی

لە دنیادا سەر بەرز بێت و لە دوارۆژدا زەلیل بێت، هەر کەسێکیش دنیا بەسەر دوارۆژدا هەڵبژێرێ ئەوا دوارۆژی لەدەست دەچێت.
ئەو قسەیەی کرد و نەیزانی چۆن کەوتە نێو خەوێکی قوڵ، دوای ئەوە بە چالاکی و وزەیەکی بێ وێنە خەبەری بووەوە وەك ئەوەی سەدەیەك بە تەواوی خەوتبێت، چاوی بە ژیانێکی نوێ هەڵهێنا کە پێشتر هیچ هەواڵ و زانیارییەکی دەربارە نەبو .
قورسی ئەو بەرپرسیاریەتییە گەورەیە لەو ڕۆژەدا دوبارە ژیانی تۆی گۆڕی.
ئەو ڕوداوە ژیانی بۆ دو قۆناغ دابەش دەکات؛ قۆناغی کۆیلایەتی و قۆناغی ئازادی. قۆناغێکی تری سێیەمیش بۆ ژیانی زیاد دەکات، ئەویش قۆناغی بەرپرسیاریەتی داناییە.
ئەو قۆناغەی تێیدا هەستی کرد کە فریشتەیەك ڕوناکی دانایی بەسەردا پرژاند و دوای خەبەر بونەوەی لەو خەوە قوڵە بڕیاریدا چیتر لە ڕۆژدا نەخەوێت، ژیانێکی نوێی ڕۆحی تایبەت دەستیپێکرد، ڕاستی وای بۆ ڕون دەبونەوە کە پێشتر نەیدەزانین، هێواش هێواش لە خوا نزیکتر دەبووەوە، نزیکتر لە خەڵك تەنانەت نزیکتر لە خۆیشی.
بیری لە وەدیهێنراو و توانای خوا دەکردەوە.
سەرنجی ژیانیدەدا، سەرنجی مرۆڤ، کە بە تێپەڕبونی کات شتی نوێ لە ژیانیدا ڕودەدات و سرووشتی زیاتر ڕون دەبێتەوە.
بەردەوام بیری دەکردەوە و تا دەهات زیاتر خۆ بەکەمزانتر دەبو و لەگەڵ خەڵکدا لێبوردەتر دەبو.
ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەرکی بەوە دەکرد، کە لەسەر مرۆڤ پێویستە هەمو کاتژمێرێك فێر ببێت، هەمو چرکەساتێك باوەڕی زیاتر ببێت، کە ئەو هەمو توانایەی خوا لە بونەوەردا دەبینێت.
هەمو ئەو ڕازانەی لە سروشت و مرۆڤدا هەن دەبونە هۆی ئەوەی زیاتر

نارامگر و هێمن و دانا بێت.
مرۆڤ له سکی دایکیدا ورده ورده پەره دەسێنێت تا شێوەی مرۆڤی خۆی وەردەگرێت، پاشان چاو به ژیان هەڵدێنێت و پێویستی به کەسێك هەیه پاکی بکاتەوەو دایبپۆشێت، دوای ئەوه بەڕوی ژیاندا دەکرێتەوه.
له دەمیدا ددانێك سەر دەردێنێ پاشان ددانێکی تر، ورده ورده زمانی دەگەڕێ، پیت پیت دەردەبڕێ، هێواش هێواش دەجولێ: جوڵه، جوڵه.
لەسەر لەپی دەستی دەڕوات، پاشان دادەنیشێت، پاشان دەکەوێته سەرپێ، پاشان ورده ورده هەنگاو دەنێت.
دوای ئەوه ددان له دەمیدا زنجیر دەبەستن و یارمەتی دەدەن که خواردن بخوات و پشت به خۆی ببەستێت و واز له سەرچاوەی خۆراکی خۆی، که مەمکی دایکییەتی بهێنێت.
ورده ورده جەستەی بەهێز دەبێت و بۆ خۆشۆردن و جل پۆشین پشت بەخۆی دەبەستێت.
هەمو ئەو قۆناغانه ڕێخۆشکردنن بۆ بەرهەمهێنانی مرۆڤێکی هێمن و کاربەجێ، چونکه مرۆڤ تەنیا جەستەی به جوانترین شێوه دروست نەکراوه، بەڵکو دەرونیشی به جوانترین شێوه دروستکراوه، بەڵام مرۆڤ به دەستی خۆی به چاوپۆشین لەو هەمو داناییەی له دروستکردن و ئامادەکردنیدا هەیه، له سروشتی خۆی یاخی دەبێت و دەستدەکات به خراپه و کاری ناڕەوا.
هیچ بونەوەرێك نییه به دڕندەیی له دایك ببێت، مرۆڤ خۆی دەرونی بەرەو ئەو ئارەزووه دوژمنکارییه دەبات و له دەرونیدا پەرەیان پێدەدا، لەبەرئەوەی دەبێته هۆی دەسکاری کردنی سروشتی پاکی خۆی، ئیدی ئەو سروشته پاکەی ژیانێکی ئارامی پێنابەخشێت، بەردەوام بەدەست قەیرانی دەرونی دەناڵێنێت، کاری وا دەکات که کەسایەتی و دەرونی دەهەژێنێت و کۆمەڵگا وەك کەسێکی نا سەقامگیر سەیری دەکەن.

مرۆڤ بەردەوام حەزی لە گۆڕانکارییە؛ خانو دەگۆڕێ، بیروباوەڕی دەگۆڕێ، تەنانەت مەیلی بە هاوسەرگیری و جیابونەوەیە.

ئەگەر خوا چاوپۆشی لە هەڵەکانی پێش باڵغ بونی بکات، بەڵام لەدوای ئەو قۆناغە بەرپرسیارە لە کردار و ڕەفتارەکانی، هەر لەبەر ئەوەیە هیچ لە بەرنامە خوداییەکان تاوانی پێش باڵغ بون تۆمار ناکەن، بەڵام هەموشیان کۆکن لەسەر تۆمارکردنی تاوان لەسەر مرۆڤ لەدوای ئەم قۆناغە، چونکە خاوەنی عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوەی خۆیەتی.

مرۆڤ بونەوەرێکی بەختیارە، چونکە لەسەر سروشتی چاکە لەدایك دەبێت نەك خراپە، لەسەر ئۆقرەگرتن لەدایك دەبێت نەك ناسەقامگیری، ئەمەش یارمەتی دەدات کە ئارامگر و هێمن بێت.

لە قۆناغە جیاجیاکانی تەمەنیدا خوا لەگەڵی دەبێت،لەکاتی ڕۆژوگرتندا لە لوتکەی برسییەتیدا یارمەتی دەدات تا خۆی بگرێت و فێری ئارامگری بکات.

خوا بێباکە لە خەڵك، بەڵام بەردەوام بەزەیی خۆی بەسەریاندا دەڕێژێت تا ژیانیان چاك بکات، چونکە ئەو مرۆڤە هەرچەند گەورەبێت هێشتا پێویستی بە چاودێری خوایی هەیە.

مرۆڤ ئەگەر لەسەر ڕێسای سروشتی خۆی بڕوات، ئەوا ژیانێکی سروشتی دەبێت و هەرچەند تەمەنیشی بڕوات هەر دەتوانێت پشت بە خەزێنەی سروشتی خۆی ببەستێت، بەڵام ئەوە مرۆڤ خۆیەتی پشت بەو خەزێنە سروشتییەی خۆی نابەستێت.

دانایی خودایی بۆ ئەوە دەست دەخاتە ژیانی مرۆڤ تا ڕێگری لە یاخیبونی سروشتی مرۆڤ بکات.

بەدرێژایی مێژو ئایینەکان بۆ ئەوە هاتون تا پشتی مرۆڤ بگرن نەوەك دژی بووەستنەوە.

ڕەوشت یەکێکە لە بەرهەمەکانی باوەڕ، هەرچەند مرۆڤ باوەڕێکی پتەوتری هەبێت ئەوەندە درەختی پیرۆزی باوەڕ زیاتر لە خۆڵی گیانیدا ڕۆدەچێت و بەری ڕەوشت دەگرێت.
هەرکەسێك نەتوانێت لەگەڵ خۆیدا بەڕەوشت بێت ناتوانێت لەگەڵ خەڵکیشدا بەڕەوشت بێت، هەتا ئەگەر بەڕوکەش ڕەوشتیش پیشان بدات، ئەوا لە دەروونێکی بە ڕەوشت هەڵناقوڵێت و کاریگەری نابێت..
لەوانەیە ڕەوشتی جوان لە مرۆڤی هەژاری داماو ببینی، کە هەرگیز مرۆڤی دەوڵەمەند و خاوەن پایە هەر هەستیشی پێناکات.
ڕەوشت بە پاکی دەرون، بە ئارامگری، بە شەرم و ئابڕو، بەزانیاری، بە تەقوا، بە ڕێز، بە ئاشتی، بە لێبوردەیی، بە ئازایەتی ئاو دەدرێ، ڕەوشت بەهەشتی مرۆڤەکانە.
هەرکەسێك ئەو ڕەوشتانەی تێدا نەبن، لەو بەهەشتە دەردەکرێ و تاهەتایە لە سەرگەردانیدا دەژی.
ئەفرێنەری گەردون مرۆڤی بە ڕەوشت پایەدار کردووەو سەرپشکی کردووە کە لە خەزێنەی ڕەوشتدا چاکە هەڵدەبژێرێ یان خراپە.

* * *

# بەشی حەوتەم

جارێکی تر ماڵەکەی جێدێڵێت و لەگەڵ ئەو چەند سەر مەڕەی هەیەتی بەرەو سروشت دەکەوێتەڕێ، تا بەتەنیا بێت و لەگەڵ خۆیدا گفتوگۆ و زیاتر خۆی بناسێت.

ئەی لوقمان ئەگەر دەرزییەکت هەبو، هەوڵ بدە بۆ کارێکی گرنگ بەکاری بێنی نەك ئەوەی ژیان لە کونە تەنگەکەیەوە ببینی.

پێویستە زانستی گرنگ و سودبەخش و زیانبەخش لە خوتخوتە جیا کەیتەوە..

هەندێ کەس توشی نەخۆشی خوتخوتەی پرسیارکردن بووە، مەبەستیشی دەستکەوتنی وەڵامی پرسیارەکان نییە؛ تەنیا خوی پێوە گرتووە !

کاتێك یەکەم جاریەتی کەسێك دەبینێت دەربارەی تەمەنی پرسیار دەکات، دەربارەی پیشەی، بیروباوەڕی، ژمارەی منداڵەکانی، پارەو سامانی، خۆ ئەگەر بە ئاسانی وەڵامەکانی دەستکەوێت ئەوا باز دەداتە پرسیاری تایبەتی و خێزانی.

ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر بە تەنیاش بن کاتیان بە شتی بێ سود بەفیڕۆ دەدەن.

مرۆڤی وا هەیە توشی نەخۆشی پرسیار کردن بووە
هەیانە توشی نەخۆشی سەیر کردن بووە
هەیانە توشی نەخۆشی بۆن کردن بووە
هەیانە توشی نەخۆشی ئارەزووبازی بووە
هەیانە توشی نەخۆشی دنیاویستی بووە

هەیانە توشی نەخۆشی دوارِۆژ ویستی بووە
هەیانە توشی نەخۆشی یاخیبون بووە
هەیانە توشی نەخۆشی گرنگی نەدان بووە.

ئەی لوقمان تەنیا بەشێکی شتەکان بۆ تۆیەو ئەوی دی واز لێبێنە بۆ کەسێکی تر، هەروەك چۆن ئەو بەشێکی واز لێهێناوە بۆ تۆ.

ئەوەش بزانە کە زانینی هەمو شتێکی ورد و درشت تایبەتە بە خوا، چونکە ئەو وەدیهێنەری بونەوەرە و بەخشەری ڕۆزی و تەمەن و زانیارییە بەسەریاندا.

تەنیا خوا خاوەنی هێزی تەواو و زانیاری تەواو و هۆشیاری تەواو و دانایی تەواوە..

هەروەها ئەوەش بزانە کە تۆ بونەوەرێکی بێهێزی و زو شت لەیاد دەکەی، لەوانەیە ئەوەی ئێستا دەیزانی دوای کاتژمێرێك نەیەتەوە یادت، ئەوەی ئێستا هەتە لەوانەیە دوای کاتژمێرێك لەدەستی بدەی..

چەند مانگێك لە دەشت و دەر مایەوە، سەرنجی جیهانی ئاژەڵی دەدا، لە جیهانی ڕووەك ڕادەما، سەرنجی زاوزێی مەرەکانی دەدا، جۆرەها ئاژەڵی دەدی، جۆرەها ڕووەك، جۆرەها بەرد..پاشان لە شەودا سەیری ئاسمانی پان و پۆڕی دەکرد، سەرنجی ئەستێرەکانی دەدا و بە ورتە ورت دەیگوت:

پاکی و بێگەردی بۆ خوا..

- هیچ خودایەك نییە جگە لە (الله) و هیچ هاوەڵ و هاوشێوەی نییە..

پاشان دەیگوت: خودا ئەگەر شتێك ببەخشێت دەیشی پارێزێت.

دوای ماوەیەك هەڵدەستا، لەتاریکایی شەودا نوێژی دەکرد، وەك ئەوەی لە بەردەم خوادا ڕاوەستاوە و زۆر لێی نزیکە.

ئەو ژیانە ڕۆحانییە تایبەتە زۆر شتیان فێر کرد؛ فێریان کرد چۆن ئارام بگرێت، چۆن رق و قینەی بخواتەوە، چۆن لە بەرانبەر ڕەفتار

و گوفتاری خەڵکدا ئارام بگرێت و چۆن بتوانێت یارمەتییان بدات..
ڕق خواردنەوەو زاڵ بون بەسەر توڕەییدا هەمیشە پێویستن تا مرۆڤ بتوانێت لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا ڕابێت کە تیایدا دەژی.
ئەو ئاماژە خواییانەی لە ناختدا هەن هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی لە ناختدا زیاد دەکەن؛ بەرانبەر بە خۆت، بەرانبەر بە خەڵك، بەرانبەر بە کات، بەرانبەر بە هەموولایەنێکی ژیان.
ئەوە (الله) یە ئەی لوقمان.
(الله) ئەو زاتەی ناوهێنانیشی نیعمەتێکی گەورەیە،
نیعمەتی ئەوەی کە تۆ دەتوانی ئەو ناوە گەورەیە دەرببڕی،
(الله) ئەی لوقمان (الله)
بە هەمو توانای هزرت سەرنج بدە،
الله،
کاتێك دەریدەبڕی هەست بە ڕۆحانیەت و بەرزی دەکەی.
الله،
هەر جارێك کە دوبارەی دەکەیەوە واتایەکی جیاواز لە واتای پێشو دەبەخشێت.
هەر جارێك ئاسۆیەکی فراوانتر لە ئاسۆی پێشوت بۆ والآ دەکات..
دوای هەر چاو لێکنانێك، دوای هەر ساتێك.
کە بە ڕێگادا دەڕۆی بڵێ: الله .
کە بێدەنگی بڵێ: الله .
کە دەدوێی بڵێ: الله .
با پڕ بیت لە یادی خوا، ئەوکات شەیتان ناتوانێت توخنت بکەوێت..
ناتوانێت خوتخوتە بخاتە دڵتەوە.
یادی خوا بەهێزترین ئامرازی ڕوبەڕوبونەوەی شەیتان و هێزی خراپەی دیار و پەنهانە لە جیهاندا.

خوا بۆ ساتێکیش خەڵك جێناهێڵێت، لەگەڵیانە، دەیانبینیێ، بیسەریانە..
بێ پشت و پەنایان ناکات،
پەیامبەریان بۆ دەنێرێت..
مرۆڤی دانا و زانا و وێژەناس وفەرمانڕەوا و دادوەریان بۆ دەنێرێت..
ئەی لوقمان سەرنجی تەواوی خەڵك بدە
سەرنجیان بدەو لێیان فێربە، چونکە تا بەوردی سەرنجی ژیانی خەڵك
نەدەی ناتوانی فێر ببی.

* * *

# بەشی هەشتەم

دووبارە دەگەڕێتەوە ماڵە نوێکەی، ئەو ماڵەی لە چاوەکانی ئەودا پیرۆزییەکی خودایی وەرگرتبو، ئەو ماڵەی گەورەترین وشەکانی لەوێدا پێگوترابون، ئەو ماڵەی گەورەترین گۆڕانکاری بەسەر ژیانیدا هێنا .

دوای دوو مانگ لە مانەوە لە ماڵەوەدا، چووە دەرەوە، هەستی بەوە دەکرد کە پێویستە ئافرەتێك لە تەنیشتییەوەبیت، ئافرەتێك هەلی قوڵتر چوونە نێو ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ بڕەخسێنێت، هەلی ئەوەی ببێتە باوك .

ئەو بیرۆکەیە بیری سەرقاڵکردبوو، لەبەر ئەوە دەستی کرد بە گەڕان بەدوای هاوسەری ژیانی، هاوڕێی ڕێگای، هاوبەشی خەمەکان و تێرکەری پێویستییە جەستەیی و ڕۆحیەکانی، ئافرەتێك ببێتە هاوسەری پیاوێك کە دانایی کردۆتە ڕێبازی ژیانی .

گەڕانی ڕاستەوخۆ بەدوای ئافرەتێکدا، خۆت لەلای خۆت و لەلای کەسانی دیش توشی شەرمەزاری دەکات .

بە ئاماژە بە یەکێك لە دراوسێکانی ڕاگەیاند کە ئەگەر ئافرەتێکی گونجاو بدۆزێتەوە ئامادەیە هاوسەرگیری بکات، ئەمە لەکاتێکدابوو کە دراوسێکەی پرسیاری لێکرد کە بۆچی تائێستا هاوسەر گیریت نەکردووە .

دوای نزیکەی دوومانگ لەو گفتوگۆیە، یەکێك لە دراوسێکانی بانگهێشتی ماڵەوەی کرد، لوقمانیش شەو چووە سەردانی، لەو سەردانەدا ئافرەتێك خواردنی بۆ دەهێنان و خزمەتی دەکردن، پیاوەکە

بە ئاماژە پێی گوت کە سەیری ئەو ئافرەتە بکات، پاشان پێشنیاری هاوسەرگیری بۆ بکات .

دوای ئەوە ئافرەتەکە چووە دەرەوە دراوسێکە پێی گوت کە ئەو ئافرەتە خوشکییەتی لە باوکیەوە لەگەڵ ئەودا دەژی و بەهۆی کێشەیەك لە هاوسەرەکەی جیابۆتەوە .

گەڕایەوە ماڵەوە تا بیری لێبکاتەوە، هەرچەندە هەر زوو گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات ئەوا تەنیا بۆ ئەوەیە کە هاوسەرگیری بکات و منداڵی ببێت، چونکە لەهەمبەر ئەو ئافرەتەدا هەست و سۆزداری نەدەجولا .

ئەو بەجۆرێ سەیری هاوسەری دەکرد کە هاوبەشی ژیانی و دایکی منداڵەکانی و هەڵگری ناوی دەبێت و دەبێتە ئەمینداری ماڵ و سامان و ئابڕوی، لەبەر ئەوە وای بەباش زانی کە واز لەو ئافرەتە بێنێت بۆ کەسێك کە بەو شێوەیە سەیری بکات .

جارێکیان کە بە یەکێك لە کۆلانەکانی شارۆچکەکەدا دەڕۆیشت، توشی ئافرەتێکی بەسالاچو بوو،

پێیگوت:لوقمان ئافرەتێکی زۆر چاك هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەی؟

گوتی:

- بەڵێ

گوتی:

بەدوامدا وەرە ..

- بەدوایدا ڕۆیشت، تا چونە ماڵێك کە پیرە پیاوێك و ئافرەتێکی تەمەن سی ساڵەی تێدا دەژیان ..

ئافرەتە بەسالاچووەکە گوتی:

- باش سەیری ئەو ئافرەتە بکە، پاشان پێم بڵێ ئەگەر ئارەزوت لی بوو.

لوقمان کاتێك سەیری ئافرەتەکەی کرد هەستی بە جۆرێك ئاسودەیی کرد، بە خەیاڵ ئەوی کردە هاوسەری، دایکی منداڵەکانی . دوای کاتژمێرێك وتی لاری نییە لە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا. ئافرەتە بەساڵاچووەکە ڕای ئافرەتە لاوەکەشی وەرگرت، ئەویش لاری نەبوو.

گەڕایەوە ماڵەوە تا خۆی بۆ ئەو قۆناغە گەورە نوێیەی ژیانی ئامادەبکات .

کاتێك شەو داهات، چەند دەنگێکی بیست کە لە دەرەوە بۆ ناوەوە دەهاتن، دەرگای کردەوە، بینی چەند ئەسپ سوارێکی شمشێر بەدەست هاتنە ژوورەوە، کە هەڵیان دەکوتایە سەر ماڵی خەڵك و هەرچی بیان و یستبایە دەیان برد .

تەنانەت نەی توانی دەرگاش دابخات کاتێك هێرشیان کردە سەر و هەرچی کەوتە دەستیان بردیان و توند ئەویان بەستەوە، هەر چەند بەرگری کرد بەڵام ئەوەندەیان لێدا تا کەوت و بورایەوە .

کاتێك هاتەوە هۆش خۆی زانی کە بە دیل گیراوەو دووبارە بووەتەوە کۆیلە و ماڵ و سامانە کەشی دەستی بەسەردا گیراوە .

دووبارە خۆی لەناو کۆیلەکاندا بینیەوە .

وەك ئەوەی کە هەرگیز کۆیلە نەبووبێت، هەستی بەوە دەکرد کە چەند ناخۆشە مرۆڤ وەك گیاندارێك بەدەست کەسێکی ترەوە بێت و هەرچی بیەوێت پێی بکات . دوای شەش مانگ خاوەنەکەی بردی بۆ بازاڕی کۆیلەکان تا بیفرۆشێت .

کەسێك لێی نزیك بووەوەو گوتی:

- جا ئەو پیرە پیاوە ڕەشپێستە کورتە باڵایە چەند دەکات !

خاوەنەکەی گوتی:

- بیست مسقاڵ زێڕ !

- گوتی خۆ بیست مسقاڵ زیویش ناهێنێت !
کەسێکی تر هات، سەیری دەکرد . خاوەنەکەی پێی گوت:
- سەیری شێوەی مەکە، ئەو لافی ئەوە لێدەدات کە دانایە .
پیاوەکە گوتی:
- دەترسم بیکرم بە ملمدا بێت و کەس لێمی نەکڕێت .
لەو کاتەدا هەر کەسێکی تر هات و گوتی:
- دەڵێ لافی دانایی لێدەدات ؟
گوتی:
- بەڵێ گەورەم .
ڕوی لە لوقمان کرد و گوتی:
- ئەوە ڕاستە ؟
لوقمان گوتی:
بەڵێ گەورەم، خوا ئەو بەهرەیەی پێبەخشیوم .
لە کۆتاییدا بە سی مسقاڵ زێڕ لوقمانی کڕی .
بردیەوە ماڵەوە، بردیە لای کۆیلەکانی، دوای دومانگ گەورەکەی بەدوایدا نارد ..
دو لیمۆی گەورەی زۆر ترشی بۆ هێنان و پێی گوت:
- پێویستە هەرئێستا هەردوکیان بخۆی .
سەرەڕای ترشی لیمۆکە هەرچۆنێك بێت یەکەمیانی تەواو کرد و، پارچە پارچە دوەمیانیشی خوارد و زۆری لە خۆکرد تا خۆی بەرانبەر ترشییەکەی بگرێ .
کە تەواوبو گوتی :
- گەورەم ئەوەی فەرمانت پێکردبوم جێبەجێم کرد .
ئەوکات گەورەکەی گوتی :
- چۆن توانیت بەرانبەر ئەو ترشیە ئارام بگری ؟

گوتی :
- گوێڕایەڵیم بۆ خاوەن شکۆ و خاوەن ئازادیەکەم یارمەتیدام تا ئارام بگرم .
پیاوەکە گوتی :
- من کاتێك گوێم لەوە بو کە تۆ دانای بڕیارمدا تۆ بکڕم . ئێستاش داناییەکەتم بۆ دەرکەوت، لەبەرئەوە لە پێناو خوادا ئازادت دەکەم تا دانایی بەناو خەڵکدا بڵاو بکەیتەوە ..
لەسەر ئەوکارەی سوپاسی پیاوەکەی کرد و، بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت .
جارێکی تر بەرەو ئەو ماڵە کەوتەوە ڕێ کە خشت خشت بنیاتی ناوەو تێیدا دانایی بەسەردا ڕژاوە .
دوای دەرۆژ ڕێکردن بە ماندویی گەیشتەوە ماڵەوە، لەسەر زەوی پاڵکەوت و خەوێکی قوڵی لێکەوت .
کە بەخەبەر هاتەوە نەیدەزانی ماوەی چەندە خەوتووە، بەڵام هەستی بە ئازاری جومگەکانی دەکرد
دوای ماوەیەك یەکێك لە دراوسێکانی هاتەلای، گوتی : ئەوە کەی گەڕایتەوە ؟
بە بێتاقەتی زمانی تەتەڵەی دەکرد :
- بەخوا نازانم .
ئەیوب چوە دەرەوە و بە هەندێك خواردنەوە گەڕایەوە و گوتی :
- دەزانم زۆر برسیتە دراوسێ .
لوقمان گوتی :
- برسییەتی خەریکە دەمکوژێ .
دەستی کرد بە خواردن و دواتر سوپاسی خودا و پاشان دراوسێکەی کرد .
لوقمان هەستی کرد کە پێویستی بە بڕێك پارە هەیە تا خانوەکەی

چاك بكاتەوە و ڕێكیببخات، بۆیە ناچار بوو هەندێك پارە لە یەكێك لە دراوسێكانی قەرز بكات تا ئەو كاتەی هێزی بۆ دەگەڕێتەوە و دەتوانێ كار بكات .
(ئەیوب) ی دوكاندار بووە كەفیلی و دراوسێكەشی قەرزی پێدا .
تاهێزی بۆ گەڕایەوە لەماڵەوە پاڵكەوت، پاشان سێ ساڵی تر دەستی كردەوە بە شوانەتی تا بتوانێت قەرزەكەی بداتەوە ..
دوبارە باسی هاوسەرگیری شالاوی بۆ هێنایەوە، بۆیە دوبارە بۆ هەمان ماڵی پێشو كەوتەوە ڕێ ..
چەند جارێك لە دەرگایدا، پیاوێكی تەمەن مامناوەند دەرگاكەی كردەوە، لوقمان دەربارەی خاوەنی خانوەكە پرسیاری لێكرد .
گوتی كە پیرە پیاوێك لەگەڵ كچەكەیدا لێرە دەژیان، بەڵام هێرشیان كرایە سەر و ئێستاش هیچ هەواڵێك دەربارەیان نییە، پاشان گوتی :
- منیش گەورەم لە دراوسێ كۆنەكانیان بوم، خۆم و منداڵەكانم لەم خانوەدا نیشتەجێ بووین تا خوا دەرگایەكمان بۆ دەكاتەوە .
فرمێسك بەری چاویان گرت بۆ ئەو ئافرەتەی یەكەمین ئافرەت بو شوێنی لە دڵی لوقماندا كردبووەوە .
ئەوكات بۆی ڕون بووەوە كە مرۆڤ چەندە دڵ ڕەقە كاتێك دەست بەسەر مافی خەڵكی تر دادەگرێت، دەست بەسەر ماڵ و سامانی كەسانی تردا دەگرێت تا دەوڵەمەند بێت، ئەوە تەنیا ڕق و كینەیە كە هەندێ كەس لە هەمبەر برایەتی مرۆڤایەتی كوێر دەكات، ئەگەر نا خۆ زەوی جێگای هەمو خەڵكی تێدا دەبێتەوە و ڕۆزییەكەیشی بەشی هەموان دەكات ..
تا دەهات زیاتر لە سەرەنجامی مرۆڤ دەترسا كاتێك بەها مرۆڤییەكان لە دەستدەدات، بەڵام متمانەشی بەوە هەبو كە دانایی دەتوانێت مرۆڤ بێنێتە سەر ڕێ ..

دوای تێپەڕ بونی دوساڵ و لە دەرگادانی بیست ماڵ بە مەبەستی هاوسەرگیری و بێ ئەنجام بونی هەوڵەکانی، دراوسێ دوکاندارەکەی (ئەیوب) پێی گوت :

- ئەی لوقمان، تۆ پیاوێکی باشی، من ئافرەتێکی گونجاو پێدەزانم .

گوتی :

- کێیە ؟

گوتی :

- خوشکی هاوسەرەکەم

لوقمان گوتی :

- ناوی چییە ؟

گوتی :

- ناوی (سادر)ە، کچە و تەمەنی سی و پێنج ساڵە .

لوقمان چووە داخوازی و دوای مانگێك هاوسەرگیری کرد، بۆ یەکەمجار کەوتە نێو ژیانی پەیوەندی نێوان ژن و پیاو ..

یەکەمین جار بوو تامی هاوسۆزی هاوسەرگیری بکات، درکی بەوە دەکرد کە مرۆڤ چەندە دەگۆڕێت کاتێك دەبێتە هاوسەر و ئەو جیاوازییە گەورەی هەست پێدەکرد کە لە نێوان پیاوێکدا هەیە کە هاوسەری هەیە و ئارامیەك شك دەبا، لەگەڵ پیاوێك کە هاوسەری نییە و دەرونی جێگیر نییە .

هاوسەرگیری قۆناغی یەکلاییکەرەوەی ژیانی پیاوە: هاوسەرگیری یەکێکی ترە لە نیعمەتە بێکۆتاییەکانی خوا .

لەو کاتەدا خەڵك پۆل پۆل لە دەرگایان دەدا، دەهاتن بۆ پیرۆزبایی کردنی، ئەویش زۆر بە خۆشحاڵیەوە بەخێرهاتنی دەکردن و میوانداری دەکردن ..

لەوکاتەوە پەیوەندی لەگەڵ (ئەیوب) زۆر توند و تۆڵ بو، کە لە

زۆر بارودۆخدا پاڵپشتی کردووه .
لەلایەکی ترەوە، لوقمان هەستی بەوە کرد کە دراوسییەکی هەیە دوژمنایەتی دەکات و ناوی (سیراخ)ە، کە دەکەوتە تەنیشت ماڵەکەی و لوقمان نەی دەزانی بۆچی ئەو پیاوە بۆتە دوژمنی و ژنەکەشی بۆتە دوژمنی هاوسەرەکەی .
کاتێك لەخەو هەڵدەستا شتی نامۆی لە ماڵە کەیدا دەدی و، ئەو کاتە هەستی بەوەکرد کە جادوویان لێکردووە تا لەهاوسەرەکەی جیابێتەوە، کاتێك لە کار دەگەڕایەوە (سادر) پێی دەگوت کە کە دراوسێکەیان شتی نامۆ و گومان لێکراو لەسەر دیوارەوە فڕێ دەداتە ماڵەکەیانەوە .
بەیانیان زو پیاوەکە بە دەنگە گڕەکەی جوێنی بە لوقمان و هاوسەرەکەی دەدا، بەڵام لوقمان وڵامی نەدەدانەوەوە، تەنانەت کاتێك دەچوە دەرەوە بۆ کار (سیراخ)ی دەدی و کە هاواری دەکرد: ئای خوا چۆن کۆیلەیەکی ڕەشپێستی ئازاد کرد و ئێستا بە ئازادی دەخولێتەوە ..
لوقمان بە هیچ جۆرێك وەڵامی نەدەدایەوە .
ڕۆژێکیان ئەیوب بەپەلە هات بۆلای لوقمان و داوای لێکرد کە زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، کاتێك گەڕایەوە بینی هاوسەرەکەی لەگەڵ هاوسەری دراوسێکەی سیراخ دەستە و یەخەکەی یەکتر بوون .
هاوسەرەکەی لوقمان گوتی :
- هێرشی کردمە سەر، بە توندی لە دەرگای دەدا، کاتێك دەرگام کردەوە دەستی بەرز کردەوە لێم بدات، بەڵام من دەستپێشخەریم کرد و لێمدا .
لوقمان پێی گوت :
- دەستەکانت خۆش بن کارێکی باشت کردووە .
لەو ڕۆژەوە ئەو ئافرەتە شەڕانگێزە سوێندی خوارد کە تا لەیەکیان جیانەکاتەوە واز نەهێنێت و بە ئاشکرایی دەی گوت کە هەمو شتێك

دەکات لەپێناو لەیەك جیاکردنەوەیان .
شەوێکیان دراوسێکان لە ماڵی لوقمان کۆبوبونەوە، بە زەردەخەنەوە میوانداری دەکردن و ئەو شیرینیەی پێشکەش دەکردن کە هاوسەرەکەی دروستی کردبو .
لەگەڵیان کەوتبووە گفتوگۆ .
دەیگوت :
نمونەی ئافرەتی باش وەکو رۆنی قژ وایە، سەر نەرم دەکات و قژ جوان دەکات ..
هەروەها ئافرەتی باش وەك و تاج وایە لەسەری پاشادا، وەکو دوڕو مەرجان وایە کەس نازانێ بەهایان چەندە .
نمونەی ئافرەتی خراپیش وەکو ئاوی لافاو وایە تا نەگاتە شوێنی خۆی ناوەستێ، هەمو دەردێك دەرمانی هەیە تەنیا ئافرەتی خراپ نەبێت .
یەکێك لە میوانەکان، کە پیرە پیاوێك بو گوتی :
- ئەی دانا، تۆ بویتە دراوسێیەکی چاك بۆمان و داناییەکەت سودمان پێدەگەینێت . ئەی دانا دانایی چی لە مرۆڤ دەکات ؟
گوتی : دانایی دڵی مردو زیندو دەکاتەوە .
پیاوەکە وتی پاشان چی ؟
گوتی : لەگەڵ هەژاران دابنیشی دەیکەیە دانیشتنی پادشایان .
گوتی پاشان چی ؟
گوتی :دانایی مرۆڤی بێ پایە پایەدار دەکات، کۆیلە ئازاد دەکات، بێگانە دەکاتە هاونیشتمانی، هەژار دەوڵەمەند دەکات .
گوتی پاشان چی ؟
گوتی : دانایی مرۆڤی پایەدار پایەدارتر دەکات، گەورە گەورەتر دەکات .

گوتی پاشان چی ؟
گوتی : دانایی لە پارە و سامان چاکترە، لە ترس و تەنگانەدا قەڵایە و لە شەڕدا چەك و تفاقە .
گوتی پاشان چی ؟
گوتی : دانایی لەکاتی قازانجدا کاڵایە، لەکاتی تەنگانەدا تکا کارە لەکاتی سەرگەردانیدا ڕێنیشاندەرە، لەکاتی بێ پۆشاکیدا پۆشاکە .
لەو کاتەدا پیاوێکی تەمەن مامناوەند گوتی :
- کام مرۆڤ ئارامگرترە ئەی دانا ؟
لوقمان سەیری کرد و بێدەنگ بو
دوای ماوەیەك پیاوەکە پرسیارەکەی دوبارە کردەوە . لوقمان هەر بێدەنگ بو، پاشان گوتی :
- ئارامگرتنێك بە ئازاردان بەتاڵ نەکرێتەوە .
پاشان هەمان پیاو گوتی :
کام مرۆڤ زاناترینە ؟
گوتی :
- ئەو کەسەی بە زانستی خەڵك زانستی خۆی زیاد بکات .
پیاوەکە گوتی :
- ئایە دەوڵەمەند بە پارە و سامانە ؟
گوتی :
نەخێر، دوڵەمەند ئەو کەسەیە کە ئەگەر چاکەیەك پێویست بو لەلای هەبێت و پێویستی بە خەڵك نەبێت .
پیاوێکی تر گوتی :
- ئەی دراوسێ، ئامۆژگاری چیم دەکەی ؟
لوقمان سەیری کرد و گوتی :
- کاتێك قسە دەکەی کورت بڕی بکە و ئەگەر مەبەستەکەت گەیاند

چی تر قسە مەکە .
پیاوەکە گوتی :
پاشان بەچی ئامۆژگاریمان دەکەی ؟
گوتی : گەر توانا و هێزت بۆ ستەمکردن پەلکێشی کردی، ئەوا تۆ هێز و توانای خوات بە بیر بێتەوە
پیاوەکە گوتی : پاشان بەچی ؟
گوتی هەوڵبدە عەقڵی خەڵکانی تر بۆ خۆت ببەی !
پیاوەکە گوتی : چۆن ؟
گوتی : لە کارەکانتدا ڕاوێژ بکە .
پیاوەکە گوتی : پاشان بەچی ؟
گوتی : ئەگەر مەیلت بە بەرپرسیاریەتی بو پێداگری لەسەر بەدەست هێنانی مەکە، مەگەر پێت ببەخشرێت، هەرگیز پشت بەو کەسە مەبەستە کە خیانەتی لێکردی، داوای هیچ شتێکیش لە مرۆڤی خراپ مەکە، چونکە ئەگەر پێت نەبەخشێت ئەوا لەسەرت بە عەیب هەژمار دەکرێ و ئەگەر پێشت ببەخشێت ئەوا منەتت بەسەردا دەکات..
لە نێو ئامادەبواندا پیاوێك دەنگی هەڵبڕی : لەلای من ئافرەت تەنیا شتێکی ناڕونە، سەرەڕای ئەوەی هاوسەرگیریم لەگەڵ دە ئافرەتدا کردووە بەڵام هێشتا لێیان حاڵی نەبووم . هەندێ جار لەبەر چاوم دانان، هەندێ جار گەمژەن، بەڵام وای بۆ دەچم نە داناو نە گەمژە !
دەنگێك گوتی : بۆمان ڕون بکەرەوە
وڵامی دایەوە : ئەگەر ئارامگربای ڕونم دەکردەوە، لەنێوان هەردو بار دایە.
سەیری لوقمانی کرد و گوتی : دەکرێ دەربارەی ئافرەت ئامۆژگاریم بکەی گەورەم ؟
گوتی :

هەوڵبدە ئافرەتەکەت زیاتر لەوەی کە تۆ لەگەڵی دادگەری لەگەڵت دادگەر بێت ...
هەوڵبدە ئارامی بۆ دابین بکەی هەر وەك چۆن دەتەوێ ئەو ئارامیت بۆ دابین بکات . با خۆشەویستی گەورەتان بێت، با خۆشەویستی دادوەرتان بێت . هەوڵبدەن لە خۆشەویستیدا پێشبڕکێ بکەن ...
لەولاوە پیاوێکی تر گوتی : ئەی دانا من پیاوێکم زۆر گەشت دەکەم بۆ گەشتەکانم ئامۆژگاری چیم دەکەی ؟
گوتی : لەگەشتەکانتدا لەخۆت زیاتر خزمەتی سواریەکەت بکە .
لوقمان کەمێك بێ دەنگ بو، پاشان گوتی : نەکەی لەسەرەتای شەودا گەشت بکەی، بەباشی خۆت بۆ گەشتەکە ئامادە بکە، چەك و جل و بەرگ و پێخەف و تەنانەت دەرزی و داویش لەگەڵ خۆتدا ببە، داوو دەرمان ببە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیدا خۆت و هاوڕێکانت بەکاری بهێنن، لەگەڵ هاوڕێکانیشتدا هاوڕا و هاوکار بە تەنیا لە بێ فەرمانی خوا نەبێت .
نەکەی ڕەوشت خراپ و بێ ئارام بی، چونکە بەو سیفەتانە هیچ هاوڕێیەکت لەگەڵتدا نامێنێتەوە ..
کارەکانت خۆش بوێ، لەسەر ناخۆشیەکان ئارام بگرە، لەگەڵ هەمو خەڵکدا ڕەوشت جوان بە، چونکە کەسی ڕەوشت بەرز خۆشەویستی کەسە پاکەکان بەدەست دێنێت ..
کوڕەکەم ئەگەر لەگەڵ کەسانێکدا گەشتت کرد لە کاروبارەکاندا ڕاوێژیان پێ بکە و لەبەرانبەریاندا هەمیشە دەم بەخەندە بە .
بە ڕزق و ڕۆزییەکەت سەخی بە لە گەڵیاندا، ئەگەر بانگیان کردی بە تەنگیانەوە بڕۆ و ئەگەر پشتیان پێت بەست پشتیان بگرە .
پاشان بۆ ماوەیێکی تر بێ دەنگ بووەوە، کەمێك ئاوی خواردەوە، پاشان گوتی : زۆربەی کات بێدەنگی هەڵبژێرە، زۆر نوێژ بکە، بەوەی

پێته لە سواری و ئاو و خۆراك بەخشندەبە .
ئەگەر لەسەر حەق داوای شایەتییان لێکردی شایەتیان بۆ بدە، ئەگەر ڕاوێژیان پێ کردی باشترین ڕایان بۆ پێشنیار بکە .
ئەگەر هاوڕێکانت دی دەڕۆن تۆش برۆ، گەر بینیتن کاردەکەن تۆش یارمەتییان بدە .
گوێڕایەلی ئەوەش بکە کە لەتۆ بەتەمەنترە .
ئەگەر فەرمانێکیان پێکردی بلێ بەڵێ، نەڵێی نەخێر .
چونکە نەخێر لەبەرانبەر داواکاری هاوڕێکانت بێ شەرمنییە ..
ئەگەر ڕێتان لێ تێك چو، دابەزن .
ئەگەر گومانتان لە ئامانجەکەتان هەبو بوەستن و ڕاوێژ بکەن .
ئەگەر کەسێکی تەنیاتان دی دەربارەی ڕێگەکەتان پرسیاری لێمەکەن و داوای یارمەتی لێمەکەن، چونکە لە چۆڵەوانیدا تاکە کەس جێی گومانە، بەڵك و دز بێت، یان شەیتان بێت، مەگەر شتێکی تری لێ ببینن کە گومان دروست نەکات..

* * *

# بەشی نۆیەم

دوای ئەوە لوقمان هەستی بە ئۆقرەیی ژیانی هاوسەری دەکرد لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، دەرکی بەوە دەکرد کە لە ئاییندەدا دەبێتە بەرپرس، بۆیە لەدارتاشی لەلای یەکێك لە دراوسێکانی دەستی کرد بەکاری دار تاشی.

لوقمان لەو کارەیدا هەستی بە ئاسودەیی دەکرد، چونکە حەزی لە دروستکردنی دەرگا و پەنجەرە و کۆڵەگەبو..

ڕۆژێکیان خاوەنی دوکانەکە لوقمانی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ دانانی کۆڵەگەیەك بۆ سەقفی خانوی ماڵێك، بەڵام لەوکاتەدا بەشێکی سەقفەکە بەسەر لوقماندا داڕوخاو لوقمان لەهۆش خۆی چو.

پیاوەکە لوقمانی هێنایەوە ماڵەوە و، خوێنی لەبەر دەڕۆیی، ئەو کاتە ئەیوب و هەندێك لە دۆستانی هاتنە سەردانی لوقمان .

دوای دوو ڕۆژ لە بێ هۆشی لوقمان چاوەکانی کردەوە، بەڵام نەیدەتوانی قاچی چەپی بجوڵێنێت.

ئەوکات زانی کە قاچی شکاوە.

نە لوقمان نە خاوەن دوکانەکە هیچ پارەیان شك نەبرد تا چارەسەری پێبکەن، بۆیە دوبارە لوقمان توشی قەرزکردن بویەوە، تا چارەسەری قاچی پێبکات و خەرجی ماڵیشی پێبکات .

لەبەر ئەوی قەرزی پێشوی کەمێك درەنگ دایەوە، ئەو کەسە ئامادە نە بو دوبارە قەرزی پێبدات، بۆیە بەکەفالەتی (ئەیوب) کەسێکی تر قەرزی پێدا .

لوقمان بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەر جێگا کەوت، دوای ئەوە وردە وردە دەیتوانی بڕوات، یەکەمین کارێکیش کە کردی گەڕایەوە بۆ دوکانەکە تا بتوانێت کاربکات و قەرزەکەی بداتەوە، تەنانەت قەرزی (ئەیوب) یشی لەسەر بو، چونکەهەرچیەك کەپێویستی بوایە لەدوکانی ئەودا دەیبرد، بەقەرزی ئەوکاتەی چاك دەبێتەوەو دەتوانێت کار بکات.
ماوەی سێ ساڵ لە دوکانەکەدا کاری کرد، لەو کاتەدا یەکەمین منداڵی (کوڕ) ی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.
ئەمەش قۆناغێکی تری ژیانی بو.
بونەوەرێکی تر لەو جیادەبێتەوەو پێویستە بەباشی چاودێری بکات وگرنگی پێبدات، تا دەتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت.
بەهاوسەرەکەی گوت: سادر با ناوی بنێین (ساران)، ڕەزامەندیت لەسەر ئەو ناوە هەیە؟
گوتی: بەڵێ، لەپەروردگار داواکارم کە بیکاتە خێر و چاکە بۆ خۆی و دایك و باوکی و خزم و دۆستانی و هەمو خەڵك.
بەوردی سەرنجی گەشەی هێواشی کوڕەکەی دەدا، لەهەر گەشەیەکیدا دەسەڵاتی خودا ووردی وەدیهینانی بۆ دەر دەکەوت.
ئەمە شێوازێکی تری خۆشە ویستی خوایە بۆ مرۆڤ، تام وچێژی باوکایەتی تام و چێژی بەرزکردنەوەی منداڵ ..
ئەو ئێستا زۆر ئاسودەیە، ئەم ئاسودەیەش خودا بۆی فەراهەم کردووە.
بەوردی سەرنجی گەشەی منداڵەکەی دەدا، ددانەکانی پێشەوە سەریان دەرهێنا، پاشان ددانەکانی پشتەوە، پاشان وردە وردە خەریك بو خواردنی نەرمی پێدەخواردن، دواتر هەڵدەوەرێن و خوا ددانی تری بەهێزی پێدەبەخشێت تابەدرێژایی تەمەنی خزمەتی بکەن.
کاتێك (ساران) تەمەنی گەیشتە پێنج ساڵ، کوڕێکی تریش هاتە دونیاوە و ناویان نا (نادان).

تا دەهات زیاتر باوەڕی بەوە پتەو دەبو، کە ئەگەر خوا مرۆڤی خۆش نەویستبا ئەوا بەمنداڵ ژیانی نەداڕازاندەوە.

لەبەرانبەر ئەم بەرپرسیارەتییە گەورەیە دا، لوقمان هەستی کرد کە ئەو کارەی لەتوانایدانییە پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات، چونکە کارەکەی جارجار دەوەستا و خاوەن قەرزەکانیش بەردەوام لە دەرگایان دەدا..

لەوکاتەدا ویستی پیشەیەکی تر فێرببێت، تالەکاتی وەستانی کاری دارتاشیدا یارمەتی بدات، دوبارە پشتی بە ئەیوب بەستەوە تا کارێکی تری بۆ بدۆزێتەوە، ئەیوب گوتی:

هاوڕێیەکی کۆنم هەیە ناوی (قورح) ە، بەرگ دورێکی کۆنە، پێم وایە دەتوانێت یارمەتیت بدات.

هەر یەکەیان سواری گوێدرێژیك بون و بەرەو دوکانی (قورح) کەوتنە ڕێ و دوای دو کاتژمێر گەیشتنە ئەوێ.

لەگەڵیدا ڕێککەوتن کە بەبێ بەرانبەر بەرگ درویی فێربکات، پاشان بۆ ماوەی ساڵێك بەبێ بەرانبەر کاری بۆ بکات، پاشان دوای ئەو ماوەیە بەکرێ کاری بۆ بکات.

لەماوەی ئەو مانگەدا، شەوانە دوای ڕاهێنان وتەیەکی پڕدانایی بەبەرگدرووەکە دەگوت.

لە ڕۆژی یەکەمدا، کاتێك ماڵئاوایی لێکرد پێی گوت:

ـ با لە دونیادا دوای هاوڕێیەکی باش، هاوسەرێکی باشت هەبێت.

پیاوەکە بە ڕێزەوە سەیری کرد و، بەسوپاسگوزارییەوە پێی گوت:

ـ تا ماوم سوپاس گوزارت دەبم بۆ ئەو وتە بە نرخە.

لە ڕۆژی دووەم دوای تەواو بونی کارەکەی پیاوەکە چاوەڕێی بیستنی وتەیەکی نوێ بو، کە پێشتر نەیبیستبێت، لوقمان گوتی:

هیچ دەوڵەمەندییەك وەکو لەشساغی نییە؟. هیچ نیعمەتێکیش وەکو سنگ فراوانی نییە.

پیاوەکە کە نیشانەی سوپاسگوزاری بە ڕویەوە دیاربو، گوتی: تۆ زیاتر لەوەی کە شایەنیم پێمدەبەخشی.
ڕۆژی سێیەم لەکاتی ماڵئاواییدا پێی گوت:
- بەردو ئاسن و هەمو شتێکی قورسم هەڵگرتووە، بەڵام هەڵگرتنی هیچ شتێك ئەوەندەی هەڵگرتنی باری دراوسێی خراپ قورس نەبووە، هەمو تاڵیەکیشم چێشتووە، بەڵام هیچ شتێك ئەوەندەی هەژاری لەلام تاڵ نەبووە.
پیاوەکە پێی گوت:
- ڕاستدەکەی لوقمان.
پیاوەکە وای لێهاتبو چاوەڕێی دەکرد شەو دابێت تا گوێی لە وتەیەکی نوی ببێت..
ڕۆژی چوارەم، پیاوەکە خۆی ئامادە دەکرد بۆ بیستنی وتەیەکی نوێ تا ژیانی ڕوناك بکاتەوە، لوقمان کە خەریك بو دەچووە دەرەوە پێی گوت: هەرکەسێکی نەفام مەکە نێردراوی خۆت، ئەگەر کەسێکی داناشت دەستنەکەوت خۆت ببە نێردراوی خۆت..
لە ڕۆژی پێنجەم، دیسان پیاوەکە چاوەڕێی بیستنی وتەیەکی نوێ بو، لوقمان پێی گوت: ئەوە کاتێك کارەکەمان تەواو دەبێ ناڕۆی هاوڕێ؟
پیاوەکە کەهێشتا ئامادەی بیستنی وتەیەکی نوێ بو، گوتی: ئەی لوقمان، من دوای دو سەعات لەڕۆیشتنت هەر بیر لەو وتەیە دەکەم کە پێت گوتوم تابەتەواوی وەری دەگرم، ئەوکاتە لێرە دەڕۆم.
لوقمان لەکاتێکدا کە خەریك بو دەڕۆیشت، گوتی: ئامادەی مردو ناشتن بەڵام ئامادەی بوك گواستنەوە مەبە، چونکە یەکەمیان دوارۆژت بیردەخاتەوەو دووەمیان دونیات لە لاشیرین دەکات.
وتەی ڕۆژی شەشەم: ناتوانی کەسانێك لە ژیانی هەتایی ئاگادار بکەیەوە، کەسەرگەرمی ژیانی کاتی بن..

٧ - تۆبەکردن دوا مەخە، چونکە مردن لەناکاو دێت.
٨ - هەرکەسێك دادگەری لەسەرخۆی جێبەجی بکات خوا پایەی بەرز دەکاتەوە.
٩ - بەرانبەر مرۆڤە خراپەکان پشت بەخوا ببەستە و، بەرانبەر مرۆڤە چاکەکانیش هۆشیاربە.
١٠ - ئەگەر بینیت کەسێك هەڵە دەکات سەرزەنشتی مەکە و تاوانەکانی خۆت بیربێتەوە.
١١ - بەبێ هۆ پێمەکەنە، بەناهۆشیاری بەڕێگادا مەڕۆ، دەربارەی شتێك پرسیارمەکە کەپەیوەندی پێتەوە نییە.
١٢ - زێڕ بە ئاگر تاقیدەکرێتەوە، بەندەی ساڵحیش بە ناخۆشی، خوا ئەگەر کەسێکی خۆش بوی تاقیدەکاتەوە، جا کە ڕازی بو خواش لێی ڕازیدەبێت، کە نارازیش بو، خواش لێی نارازی دەبێت.
١٣ - ڕوی خۆت بە زۆر شت داواکردن ناشرین مەکە، قەدری خۆیشت بزانە لەژیانتدا سودی زۆرت پێدەگەیەنێت
١٤ - خەڵك دەڵێن چی بو دوارۆژ هەر نەهات، لەکاتێکدا ئەوان بەرەو دوارۆژ پێشبڕکێ دەکەن.
١٥ - ئەگەر گومانت لە مردن هەیە، مەخەوە، چونکە چۆن دەخەوی ئاواش دەمری، ئەگەر گومانیشت لەزیندوبونەوە هەیە، ئەوا لە خەو بەخەبەر مەیەوە، چونکەچۆن بەخەبەر دێیتەوە ئاواش زیندو دەکرێیەوە.
١٦ - بۆ ڕوبەرو بونەوەی هەژاری پشت بە حەڵاڵ ببەستە، چونکە هەرکەسێك هەژاربێت سێ شتی توش دەبێ: ئاینی ناسك دەبێت، هزی بێهز دەبێت، پیاوەتی کەم دەبێتەوە، لەهەرسێکیشیان گەورەتر ئەوەیە کە خەڵك بەکەمی دەزانێت.
١٧ - شتە بچوکەکان بەکەم مەزانە، چونکە ئەو بچوکانە سبەی گەورە دەبن.

١٨ - نەکەی درۆ بکەی، چونکە ئاینت تێکدەدات، پیاوەتیت لەدەستدەدات، پلەوپایەت کەمدەبێتەوە و کەس گوێت بۆ ناگرێت و ڕاستیش بڵێی کەس باوەڕت پێناکات.

١٩ - هیچ شتێك بۆ جەستە لە ئامرازەکانی ڕابواردن خراپتر نییە.

٢٠ - ئامۆژگاری لەسەر مرۆڤی نەفام زۆر قورسە، وەك چۆن سەرکەوتن بەسەرکێوێکدا بۆ مرۆڤی پیر قورسە.

٢١ - زۆر دانیشتن جەرگبڕە و تەمبەڵی بەرهەمدێنێت، بۆیە کەم بەبێ کار دانیشە.

٢٢ - تەنیایی بۆ زۆر بیرکردنەوە باشە، زۆر بیرکردنەوەش ڕێگای بەهەشتە.

٢٣ - هەندێك قسە لەبەرد ڕەقترن، لەدەرزی تیژترن، لەئارامگرتن تاڵترن، لەپشکۆ گەرمترن، دڵەکان وەك کێڵگە وان، بۆیە قسەی باشی تێدا بچێنە، ئەگەر هەموشیان سەوزنەبن هەندێکیان هەر سەوز دەبن.

٢٤ - هیچ شتێك لە قسەی خراپ لەسەر دڵ قورستر نییە، لەدڵدا ڕۆدەچیت هەروەك چۆن ئاسن لەئاودا ڕۆدەچێت.

٢٥ - توڕەبونی عاقڵ لەگوفتاریدایە، توڕەبونی نەفام لە کرداریدایە.

٢٦ - دوربین ترین کەس ئەوکەسەیە، کەپێشبینی ڕوداوەکان دەکات بەر لە ڕودانیان..

٢٧ - نەرم و نیانی ئەوەیە کە لە و کەسە ببوری کە ستەمی لێت کردووە و خراپە بەچاکە وەڵام بدەیەوە.

٢٨ - عاقڵ لەماڵی خۆیدا منالانە ڕەفتاردەکات و لەناو خەڵکدا پیاوانە.

٢٩ - برایان سێ جۆرن: هەیە چاکەی لێت دەوێ و پاداشتت ناکات، هەیانە بە ئەندازەی چاکەت لەگەڵیدا پاداشتت دەکات، هەشیانە بەبێ هیچ بەرانبەرێك حەز بە برایەتیت دەکات.

٣٠ - چاکە تەنیا بەکەسی شایەن بە خۆی بسپێرە.

بەر لەوەی لوقمان جێی بهێڵێت، پیاوەکە لێی نزیك بووەوە، پێی گوت: دەمەوێت شتێك بزانم، زۆر دەمێکە سەرقاڵی کردوم:
لوقمان گوتی: ئەو شتە چییە؟
پیاوەکە گوتی: چۆن بزانم بەهەشتیم یان دۆزەخی؟
لوقمان گوتی: لەخۆت بپرسە: ئایا من خەڵکم خۆش دەوێ، ئایا من کەسێکی دەستپاکم، ئایا کەسێکی ڕاستگۆم، ئایا کەسێکی لێبوردەم، ئایا کەسێکی بەسودم؟
پرسیاری یەکەم کەپێویستە لەخۆتی بکەی ئایا من خەڵکم خۆشدەوێ، ئایا توانای خۆشەویستیم هەیە، ئایا خۆشەویستیم زیاتر و زاڵترە لە ڕق و کینە..
لەخۆتەوە دەستپێبکە، ئایا خۆتت خۆشدەوێ؟
پاشان بە مێژوی پەیوەندیت لەگەڵ خۆت بچۆرەوە؟ ئایا لەگەڵیدا باش بوی یان خراپ؟ ئایا ئەو ناوەی هەڵتگرتووە واتکردووە خەڵك بە چاکە باست بکەن یان بە خراپە؟
سەیری خودی خۆت بکە، بزانە کاری چاکەت پێشکەش کردووە و بوێتە هۆی ئەوەی شانازی پێیەوە بکەی، بیر بکەوە بزانە چەند کار هەبوون تۆ نەبای چاك نەدەبون، چەند کاری قورس هەبون تۆ نەبای ئاسان نەدەبون، ئێوانی چەند دوژمنت چاك کردووە..
سەیری پەیوەندی خۆت بکە بەکەسە نزیکەکانت، پاشان تا دورترین خەڵك..
سەرنجی خزم و کەست بدە، دراوسێکانت، بزانە لەگەڵ چەندیاندا لەناکۆکیدای، پاشان لەگەڵ دراوسێکانت تادەگاتە هەمو جیهان، ئایە جیهان لەدیدی تۆدا دوژمنە، یا دۆست، ئایا کەس لەجیهاندا بەچاوی دوژمنداریەوە سەیرناکەی، ئایا ئەگەر بکرێیە پاشای جیهان هەمویان وەکو ددانەکانی شانە یەکسان سەیردەکەی، یان ئەو ددانانەی بە چاکیان

نازانی هەڵیان دەکێشی! لەو ڕێیەوە دەتوانی بزانی ئایا خۆشەویستیت زیاترە یان ڕق و کینە.

پرسیاری دووەم کە پێویستە لەخۆتی بکەی: ئایا من کەسێکی دەستپاکم؟ و ئەمانەتپارێزم؟

پاشان سەرنجی ئەو هەڵوێستانە بدە، چەند جار ڕاسپاردەکانت گەیاندۆتەوە دەست خاوەنەکانیان، چەند جار خیانەتت لێکردووە و زیانی ماددی و مەعنەویت بە خاوەن ڕاسپاردە گەیاندوە.

پرسیاری سێیەم کەپێویستە لە خۆتی بکەی:

ئایا من ڕاست گۆم؟ لە ئاوێنەی دەروونتەوە سەیری خۆت بکە، ئایا تۆ کەسێکی ڕاستگۆی، ئایا کەسێکی درۆزنی، کاتێك کە قسە دەکەی قسەکانت ڕاستی زیاتر تێدایە یان درۆ، ئایە دەرونت زیاتر مەیلی بەڕاستگۆییە یان بە درۆ، ئایا لەژیانتدا زیاتر ڕاستگۆبوی یان درۆزن، لەڕێی وەڵامی ئەو پرسیارانەوە دەتوانی خۆت هەڵسەنگێنی.

پرسیاری چوارەم کە پێویستە لەخۆتی بکەی؟

ئایا من لێبوردەم؟

سەرنجی ژیانی خۆت بدە، چەند جار لەوکەسانەت بوریوە کە شایەنی سزای تۆ بوون بەڵام تۆ لێت بورین، چەند جار بەرانبەر مافی سەروەت و سامان و جەستە و ئابڕوت لێبوردە بووی.

پرسیاری پێنجەم کەپێویستە لە خۆتی بکەی:

ئایا من کەسێکی بەسودو بەرهەمم؟

سەرنجی کارەکانت بدە لە ژیان، ئایا لە پیشەکەتدا سەرکەوتوی، ئایا توانیوتە بەو پیشەیە سودێك بە خەڵك بگەیەنی، یان کەسێکی بێ سودی و خەڵك و پیشەکەت بۆ بەرژەوەندی خۆت بەکار دێنی.

دەتوانی ئەو هەڵوێستە چاك و خراپانە بخەیە سەر تەرازوو خۆتی پێ هەڵسەنگینی.

بەر لەوەی لێت بپرسن لە خۆت بپرسە: ئایا لەڕێی سەرنج دان لەکارە چاکەکانی ژیانت وا هەستدەکەی شایەنی بەهەشتی یان بەهۆی کردارە خراپەکانتەوە شایەنی دۆزەخی، ئەگەر بتکەن بەدادوەر لەسەر خۆت، دەیبەیتە بەهەشت یان بەرەو دۆزەخی دەبەی.

* * *

# بەشی دەیەم

لوقمان لەهەمبەر ئایندەی دوو کوڕەکەی هەستی بە جۆرێك لە ئاسودەیی دەکرد چونکە ئێستا دوو پیشەی هەیە و دەتوانێ لەڕێی کارەکانیەوە زیاتر خواپەرستی بکات، ئەو دەیەوێ لە ژیاندا بەرز و بەڕێز بژی نەك سوك و ریسوا، دەیەوێت زیاتر پرسیاری لێبکرێت لەوەی پرسیار بکات، زیاتر ببەخشێت لەوەی پێی ببەخشرێ، سودی چیە کە مرۆڤ لەناو نوێژگایەکدا لە دەرگا لەسەر خۆی دابخات و خەریکی خواپەرستی بێت و بەڵام سودی بۆ کۆمەڵگاکەی نەبێت.
ئەی لوقمان کاتێك سودێك بە خەڵك دەگەیەنی سوپاسی خودا ئەکەی، چونکە توانیوتە سودێك بەبەندەکانی خوا بگەیەنی، هەروەها پێویستە سوپاسگوزاری خوا بکەی چونکە یارمەتی دای تا ئەو کارە ئەنجام بدەی.
کاتێك (ساران) گەیشتە تەمەنی پازدە ساڵی بەباوکی گوت، کە خەریك بوو بەرەو دوکانی بەرگدروی دەڕۆیشت: باوکە زۆر حەزم لە پیشەی بەرگ دروییە دەمەوێت فێری ببم. ئەوکاتە لوقمان بیرۆکەی دانانی دوکانێکی سەربەخۆی بەبیردا هات، سەیری کورەکەی کردو گوتی بیرێکی لێدەکەمەوە.
ڕۆژی دواتر لەکاتی گەڕانەوە لەکار چوو بۆ سەردانی (ئەیوب).
بینی خەمبارە.
لوقمان گوتی:
- لوقمان گوتی دەبینم خەمباری هاوڕێ

ئەیوب وەڵامی دایەوە:
- بەهۆی کردارەکانی کوڕە یاخییەکەمەوە خەمبارم،
تەمەنی بیست ساڵە هێشتا بەرانبەر ماڵەوە هەست بەبەر پرسیاریەتی ناکات، سبەی کە من دەمرم ئەو شوێنی من دەگرێتەوە، من خەمی دایکی و خوشکەکانیمە.
لوقمان گوتی:
- تۆ لەوە بەرپرسیاری ئەیوب، منداڵ لە دەستی باوکیدا وەکو هەویر وایە لە دەستی نانەوا دا چۆنی بیەوێ، نانی ئاوای لێدروست دەکات.
گوتی:
- چۆن؟
- هەر منداڵێك شێوازی مامەڵەی تایبەتی دەوێ هەندێك جار منداڵ پێویستی بە هەندێك ترس هەیە لە باوکی، ئەی ئەیوب بەزمانت لێیبدە بەر لە دەستت. بە نیگای چاوەکانت بیترسێنە بەر لە ترساندنی بە لێدان، ئەمە بۆ منداڵ وەکو پەین وایە بۆ کشتوکاڵ، با لێدانەکانت بۆ ڕاستە ڕێکردن بێت نەك بۆ ترساندن.
ئەی ئەیوب کاتێك کە منداڵەکەت لێت ناترسێت پێویستە زۆر لێی بترسی، هەروەك چۆن کاتێك ژنەکەت ڕێزت ناگرێت پێویستە زۆر لێی بترسیت.
لەو کاتەدا ئەیوب گوتی:
- ئەدی کەی دەبێت خاوەن ماڵ ترسی لەخۆی هەبێت؟
لوقمان کەمێك بێدەنگ بو پاشان گوتی:
- کاتێك لەپەروەردگاری ناترسێت.
دوای ئەوە لوقمان بە ئەیوبی وت کە بۆ ئەوە هاتوە تا دەربارەی بەکرێ گرتنی دوکانێك بۆ پیشەی بەرگدرویی لەگەڵ کوڕەکەی (ساران) ڕاوێژی پێبکات.

ئەیوب گوتی:
- بیرۆکەیەکی باشە.
لوقمان دوکانێکی دۆزیەوە دوای ئەوەی مۆڵەتی لە مامۆستاکەی (قۆرح) وەرگرت و کارەکەی جێهێشت.
گوتی:
- مامۆستا تا سێ مانگی تر لەلات کاردەکەم تا کەسێکی تر دەدۆزیتەوە.
(قۆڕح) وتی:
- بەڕاستی دووری تۆ کارێکی قورسە، چونکە من دەست پاکی و دانایی و گرنگیدان بە کارەکان لەتۆوە فێربووم، بەڵام دەزانم بەرپرسیاریەتی بەخێوکردنی خێزان داهاتێکی زیاتری دەوێ، لەوەی لای من دەستت دەکەوێ، هەروەها دەزانم کەچەند قەرزاری. لەخوا دەپاڕێمەوە کە لەکارەکەتدا سەرکەوتوت بکات.
لوقمان گوتی:
- زۆر سوپاس مامۆستا، منیش لەخوا داواکارم کە رۆزی حەلاڵمان بەقسمەت بکات.
ساڵ لەدوای ساڵ دوو کوڕەکانی هەردو پیشەی دارتاشی وبەرگ درویی لەباوکیان فێردەبون و یارمەتیان دەدا، ئەویش چاودێری دەکردن و شانازی بەوە دەکرد کە توانیویەتی دووکەسی سود بەخش پێشکەشی جیهان بکات.
ئەو ئێستا لەناو جەرگەی ژیاندا دەژی، جارنا جار قۆناغی نوێی بۆ دێنە پێش.
باوکایەتی؛ وشەیەکی پڕ لەڕاز، بەرپرسیاریەتێکی گەورە.
پێشان خاوەنی ماڵکی چۆڵ بوی، بەڵام ئێستا خاوەنی خێزانێکی.
ئیستا خوا بەرپرسیاریەتی بەخێوکردنی دوو کوڕی خستۆتە ئەستۆت،

بەخێویان بکەی، بەرەو باوەڕ ڕێنوێنیان بکەی، فێری ڕەوشتی باشیان بکەی، خەڵاتی خوایی قەبوڵ بکەی، چاوەکانت بەرەو ئاسمان بەرز بکەیەوە و بڵێی:
خوایا، ئەوەی لەتوانامدا هەبوو بۆ پارێزگاری کردن لەو خەڵاتەت ئەنجامم دا.
ئەی لوقمان ئەگەر هەوڵەکانیشت بێبەرهەم بوون ئەوا لەلای خوا پاداشتی دڵسۆزیەکەت وەردەگری، پاداشتی ئامۆژگاری، پاداشتی پەیداکردنی پارویەك، پاداشتی دابینکردنی پۆشاکێك، پاداشتی نەخەوتنی شەوێك، تەنانەت پاداشتی خەندەیەك، پاداشتی ماچێك لەو خەڵاتەی خودا پێی بەخشیوی.
لەنیوەشەودا دوای ئەوەی دوو کوڕەکەی خەوتن، (سادر) پێی گوت کە سکی ئازاری هەیە و هەندێك جار دڵی بەخێرایەکی بێئەندازە لێدەدات. ئەویش ئامۆژگاری کرد کە پشو بدات تا بەتەواوی چاکدەبێتەوە خۆی ماندونەکات.
ڕۆژێکیان کوڕەکەی (نادان) کە گەیشتبوە دوازدە ساڵی گوتی:
باوکە دەمەوێ شتێکم پێبڵێی.
بەڵێ کوڕەکەم. گوتی چۆن دەتوانم هەموو خەڵك ڕازی بکەم؟
لوقمان وەڵامی نەدایەوە، سپێدەی ڕۆژی دواتر داوای لەکوڕەکەی کرد بەرلەوەی بڕۆن بۆ سەرکار پێکەوە پیاسەیەك بکەن.
نادان گوتی: بەسەرچاو باوکە.
داوای لێکرد کە بڕوات گوێدرێژەکە بێنێ.
نادان بەخێرایی چوو گوێدرێژەکەی هێنا و بەرە و دوری ئاوەدانی بەڕێ کەوتن.
کەمێك دوور کەوتنەوە کوڕەکە هەر چاوەڕێ بوو تا باوکی قسەیەك بکات و بزانێ ئاخۆ بەرەو کوێ دەڕۆن، لوقمان گوێدرێژەکەی وەستاند،

دوای ماوەیەك سواربووەوە و بەکوڕەکەی گوت بەپیادە لەگەڵی بڕوات.
لوقمان هیچ قسەی نەدەکردو نادانیش هەر چاوەڕێ بو.
دوای ماوەیەك گەیشتنە لای کۆمەڵە خەڵکێك کە لەژێر سێبەری دارێك دانیشت بون، سڵاویان لێکردن.
سڵاویان وەرگرتەوە، پاشان یەکێکیان گوتی: سەیری ئەو پیاوە دڵڕەقە ناکەن، خۆی سواری گوێدرێژ بوە کوڕەکەشی بە پیادە دەڕوات!
کوڕەکەی ئاوڕیدایەوە خەریك بوو وەڵامی بداتەوە بەڵام لوقمان نەیهێشت، لەڕۆیشتن بەردەوام بون..
دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیان جێهێشت، لوقمان گوێ درێژەکەی ڕاگرت، داوای لەکوڕەکەی کرد کە سواربێت .
کوڕەکە دودڵ بوو، پێی جوان نەبو خۆی سواربێت و باوکی پیری بە پیادە بڕوات، بەڵام باوکی فەرمانی پێکردبو.لەڕۆیشتن بەردەوام بون، لەڕێگادا گەیشتن بەدو کەس، کاتێك بەپێشیاندا تێپەڕین و سڵاویان لەیەکتر کرد گوێیان لەدەنگی یەکێکیان بوو بە هاوڕێکەی دەگوت: سەیرکە سەیرکە، ئەو کوڕە یاخییە، خۆی سواری گوێ درێژەکە بووەو باوکی پیری بە پیادە دەڕوات !
دیسان کوڕەکە ویستی وەڵامی بداتەوە بەڵام باوکی نەیهێشت و لە ڕۆیشتن بەردەوام بون.
دوای ماوەیەك باوکی داوای لێکرد کە بوەستێ، ئەوکاتە بەیەکەوە سواری گوێ درێژەکە بوون و لە ڕۆیشتن بەردەوام بون.
بەلای کۆمەڵە خەڵکێکدا تێپەڕین کە لەبەردەم ماڵێك دانیشتبون، سڵاویان کرد، وڵامیان دایەوە، پاشان یەکێکیان گوتی: ئای لەو دڵڕەقانە بەزەییان بەو گوێ درێژە بەستەزمانە نایەتەوە.
دوای ماوەیەکی تر داوای لە کوڕەکەی کرد کە گوێ دریەژەکە بوەستێنێ، تا هەردوکیان بە پیادە بڕۆن. بەلای سێ پیاودا تێپەڕین

سڵاویان لێکردن، وەڵامیان دایەوە پاشان یەکێکیان بە دوو هاوڕێکەی تری گوت:

- بەڕاستی سەیرە، گوێدرێژیان پێیە و سواری نابن!

ئەو کاتە کوڕەکە بە باوکی گوت:

بەڕاستی باشترین وەڵامت دامەوە باوکە گیان.

* * *

# بەشی یازدەهەم

کاتێك ساران تەمەنی گەیشتە بیست ساڵان، لوقمان پێی گوت:
کوڕەکەم دەمەوێ ئەمشەو بە تەنیا ئامۆژگاریت بکەم .
(سادر) نوستبو، ئازاری سکپڕی هەبو .
ساران زۆر خۆشحاڵ بو، گوتی: ئەمشەو شەوی منە باوکە..بەڵێ شەوی منە. ئەو شەوەی زۆر دەمێکە چاوەڕێم..دەستیکرد بە ماچ کردنی هەردو دەستی باوکی، پاشان چو خۆی بشوات و جلی نوێ لەبەر بکات، لە نیوەشەودا بە تەواوی ئامادەبو و چووە لای باوکی .
لەلای ڕاستی خۆیەوە داینیشاند و پێی گوت:
کوڕەکەم دەمەوێ چەند ئامۆژگارییەکت بکەم کە لە ژیانتدا سودیان لێببینی.
ساران گوتی: باوکە زۆر داوام لێکردی ئامۆژگاریم بکەی، بەڵام تۆ هەر دەتگوت لە کاتی خۆیدا.
گوتی: لەماوەی پێشودا پێویست بو بە کردار ئامۆژگاریت بکەم، بەڵام ئێستا پێویستە بە گوفتار ئامۆژگاریت بکەم.
گوتی: من هەمو جەستەم گوێبیستتە باوکەگیان .
لوقمان گوتی:
کوڕەکەم نەکەی تەمەڵ یان یاخی بی، چونکە ئەگەر تەمەڵ بی ناتوانی خزمەت بکەی، ئەگەر یاخیش بی ناتوانی لەسەر حەق ئارام بگری.
کوڕەکەم، کە تێر بوی خواردن مەخۆ، ئەو خواردنەی بە سکی تێر دەیخۆی بیدەیتە سەگێکی برسی باشترە .

کوڕەکەم، باشترین خواردن بخۆ و لەسەر نەرمترین جێگا بخەوە .
ئەوەش بزانە کوڕەکەم، ئەگەر گەدە پڕ بو، هزر خاو دەبێت و ئەندامەکانی لەش لە خواپەرستی دەکەون..
کوڕەکەی کە زۆر بەجوانی گوێی لێگرتبو، گوتی:
بەسەرچاو باوکە.
لوقمان بە دەنگێکی هێمن گوتی:
کوڕەکەم، نە ئەوەندە شیرین بە قوتت بدەن، نە ئەوەندە تاڵ بە فرێت بدەن.
کوڕەکەم، نەکەی درۆ بکەی، چونکە درۆ ئابینت لاواز دەکات، لە کەسایەتیت کەم دەکات، بەمەش ئابرو و پلەوپایەت نامێنێت و کەس گوێ بۆ قسەکانت ناگرێت، کەس باوەڕ بە قسەکانت ناکات، ژیانیش ئەگەر ئاوای لێهات سودی چییە؟
پاشان بە دەنگێکی هێمن گوتی:
- واز لە هاوڕێی یەکەمت مەهێنە..
هەزار هاوڕێت هەبێت کەمە، یەك دوژمنت هەبێت زۆرە.
کوڕەکەم، با چەکی دژی دوژمنانت لێبوردەیی بێت..
کوڕەکەم، زانای دانا بە بێدەنگی و بە ڕێزەوە بانگەوازی خەڵك دەکات، بەڵام نەفام بە زۆرڕەوی بۆیە خەڵك لێی دوردەکەونەوە .
کوڕەکەم، دانایەك لێت بدات، ئازارت بدات باشترە لەوەی نەفامێك بۆنخۆشت بکات .
هەروەها بزانە کە مرۆڤ سێ بەشە...
کوڕەکە گوتی: بەڵێ باوکەگیان:
گوتی: بەشێکی بۆ خوا، بەشێکی بۆ خۆی، بەشێکی بۆ خاك.
ئەوەی بۆ خوایە، ڕۆحیەتی.
ئەوەی بۆ خۆیەتی، کرداریەتی .
ئەوەی بۆ خاکە، جەستەیەتی .

کوڕەکەم، ڕاوێژ بەو کەسە بکە کە ئەزمونی هەیە، چونکە ئەو ڕایەی بە گران دەستی کەوتووە بەبێ بەرانبەر پێت دەبەخشێت.
ساران گوتی: بەسەرچاو باوکە گیان..
بە دەنگێکی بەرز گوتی:
- کوڕەکەم دەست بە داناییەوە بگرە پلەوپایەت بەرز دەکاتەوە، هەروەها بزانە کە ڕژدی و چاوچنۆکی و ڕەوشتی خراپ و زۆر داواکردنی شت لە خەڵك نیشانەی نەفامین .
لەکاتێکدا کە بە وردی سەرنجی کوڕەکەی دەدا، گوتی: داوای لێبوردن لە کەسێك مەکە کە نایەوێ داوای لێبوردن ببیستێت، پشت بە کەسێك مەبەستە کە نایەوێ بە ئامانجەکەت بگەی .
ساران گوتی: بەڵێ باوکە گیان.
گوتی: لەلای نەفامەکان باسی دانایی مەکە بەدرۆت دەخەنەوە، لەلای دانایانیش باسی باتڵ مەکە ڕقیان لێت دەبێتەوە، ئەوەی قسە بۆ کەسێك بکات کە گوێی بۆ نەگرێت، وەك ئەوە وایە کە خۆشییەکانی پێشکەشی مردووان بکات .
کوڕەکەم، هەر شتێکت بۆ هاتەپێش نەکەی ئەوەت بە دڵدا بێت کە چاکەی تۆ لە شتێکی تردا بو، هەر شتێکت بەسەر هات لە ویژدانتدا بیچەسپێنە کە ئەوە چاکە بۆت هاتۆتەپێش ..
کوڕەکەم، لە بەدەستهێنانی زانستدا پێشبڕکێ بکە، چونکە میراتێکی پاك و هاوڕێیەکی بەهێزە .
کوڕەکەم، درۆی گوتووە ئەو کەسەی گوتویەتی خراپە بە خراپە دەکوژێتەوە، ئەگەر ڕاست دەکات با دو ئاگر بکاتەوە و سەیربکات بزانە یەکتر دەکوژێننەوە؟ بەڵکو خراپە بە چاکە دەکوژێتەوە، هەروەك چۆن ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە.
لوقمان کەمێك بێدەنگ بو، قومێك ئاوی خواردەوە، چەند ساتێك بە

بێدەنگی مایەوە و کوڕەکەی هەر چاوەڕێ بو..
لوقمان گوتی:
کوڕەکەم، خەڵکانی پێشو بۆ منداڵەکانیان خەریکی کۆکردنەوە بون، بەڵام سەرنج بدە، نە ماڵی کۆکراوە نە ئەو کەسەیش کە بۆی کۆکرایەوە نەمان.
کوڕەکەم، تۆ بەکرێ گیراوی، فەرمانت پێکراوە کارێك بکەی و لە بەرانبەردا پاداشت وەردەگری، بۆیە کارەکەت بکەو پاداشتەکەت وەربگرە، لە دنیادا وەك ئەو مەڕە مەڕی کە چووە ناو لەوەڕگایەکی سەوز تا قەڵەوبو خواردی، نەیدەزانی کە مردنی بەندە بە قەڵەوبونییەوە!
دنیا بکە بە پردێك بەسەریدا بپەڕەوەو هەرگیز بۆی مەگەڕێوە..
بزانە کاتێك لەبەردەم خوا ڕادەوەستی دەربارەی چوار شت پرسیارت لێدەکرێ:
گەنجیت لەچیدا بەسەر برد، تەمەنت لە چیدا بەڕێکرد، زانست و زانیارییەکەت چی لێکرد، پارەو سامانت چۆن بەدەستهیناو چۆنت خەرج کرد، بۆیە خۆتی بۆ ئامادە بکەو وەڵامێکی بۆ حازرکە.
کوڕەکەم، تامی تاڵی و ئارامگریم چەشتووە، بەڵام هیچ شتێکم لە هەژاری تاڵتر نەدیوە .
ئەگەر هەژار بوی لەلای خەڵك باسی مەکە تا بەکەم سەیرت نەکەن، بەڵکو داوا لە خوا بکە تا پێت ببەخشێت، کێ هەیە داوای لە خوا نەکردبێت و پێی نەبەخشیبێت؟ یان داوای کردبێت و وەڵامی نەدابێتەوە، یان پەنای بۆ بردبێت و بە هانایەوە نەهاتبێت؟!
کوڕەکەی زۆر بە وردی سەرنجی باوکی دابو، هەستی دەکرد کە باوکی لە هەمو کەس لێیەوە نزیکترەو لە هەمو کەس زیاتر خەمی ئەویەتی، بۆیە بەو شەوە تاریکە خەریکە ئامۆژگاری دەکات .
چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسك و دەستیکرد بە ماچ کردنی هەردو دەستی باوکی، پاشان دانیشتەوەو لوقمان گوتی:

کوڕەکەم، نەکەی سواڵ بکەی، چونکە ئاوی ئابڕوی نێوچاوانی مرۆڤ ئاهێڵێت .
کوڕەکەم، ئامۆژگارییەکت دەکەم، کە لە ڕەزامەندی خوا نزیکت دەخاتەوە و لە توڕەیی دوورت دەخاتەوە.
ساران گوتی: فەرمو باوکە گیان
لوقمان بە چاوی پڕ لە دڵسۆزی باوکایەتی گوتی:
یەکەم: خودا بپەرستە و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە.
دووەم: پێت خۆش بێت یان پێت ناخۆش بێت بە قەدەری خوا ڕازیبە .
لوقمان هەستیکرد کوڕەکەی باش گوێی بۆ گرتووە، بۆیە بەردەوام بو:
ئەگەر خەڵك بە قسەی جوانیان شانازی بکەن، تۆ بە جوانی بێدەنگیت شانازی بکە .
هەمو بەیانییەك زمان بە ئەندامەکانی لەش دەڵێت: ئێوە چۆنن؟ دەڵێن: ئەگەر لێمان بگەڕێی باشین !
هەروەها ئەوەش بزانەکوڕەکەم، هەرکەسێك ڕەحم بکات ڕەحمی پێدەکرێت.
هەرکەسێك بێدەنگ بێت سەلامەت دەبێت، ئەوەی شتی باش بڵێت پاداشت وەردەگرێ، ئەوەی خراپە بڵێت سزا دەدرێ، هەرکەسێکیش جڵەوی زمانی بەدەست نەبێت پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ !
کوڕەکەم، سێ خەسڵەت هەن لەهەر کەسێکدا هەبن باوەڕی تەواوە:
ئەوەی ئەگەر نیعمەتی بەسەرداڕژا لە حەق دوورنەکەوێتەوە، توڕەبون لە بازنەی حەقی لانەدات، ئەگەر دەسەڵاتی هەبو شتێك کە هی ئەو نییە بۆخۆی نەیبات.
پاشان گوتی: مرۆڤی ئازا لەشەڕدا دەردەکەوێت، مرۆڤی سەخی لەکاتی پێویستیدا دەردەکەوێت، مرۆڤی هێمن لەکاتی توڕەبوندا دەردەکەوێت.
کوڕەکەم:
مەجلیس خۆش و چاکەکاربە، زۆر بیربکەوە و بۆ حەق نەبێت کەم قسە

بکە، زۆر بگری و کەم پێبکەنە.
کوڕەکەم سیفەتەکانی دانای خۆشبەخت بریتییە لە ڕێزداری
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: ئارامی
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: چاکەکاری
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: دادگەری
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: هێمنی
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: زانست
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: دووربینی
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: هۆشیاری
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
گوتی: لێبوردەیی
کوڕەکەی گوتی: بەڵێ
کوڕەکەی چەندین ساڵ بو چاوەڕێی شەوێکی ئاوابو، خەمی ئەوەی بو کە شەوەکەی بەرەو تەواوبونە، دنیا کەمێك ڕوناك بو، لوقمان لەسەر قسەکانی بەردەوام بو:
کوڕەکەم، مرۆڤی دانا کە قسە دەکات بە زانست قسەدەکات..
گوتی: بەڵێ
گوتی: ئەگەر بێدەنگیش بو بە هێمنی بێدەنگ دەبێت..

گوتی: بەڵێ
گوتی: ئەگەر ستەمی لێبکرێ دەبورێ.
گوتی: بەڵێ
گوتی: ئەگەر داوای لێبکرێ دەبەخشێ
گوتی: بەڵێ
گوتی: ئەگەر شتێك ببەخشێت منەت ناكات..
گوتی: بەڵێ
گوتی: ئەگەر پێیببەخشرێت سوپاسگوزاری دەكات..
گوێ بۆ ئەو كەسە دەگرێت كە ئامۆژگاری دەكات، ئەو كەسەی لەخۆی نزمتر بێت بە كەمی نازانێت، ئەوەی هی خۆی نەبێت داوای ناكات، ئەوەی هی خۆیشی بێت دەستی پێوە دەگرێت و لەدەستی نادات، ئەوەی نەیزانێت نایڵێت، زانستەكەی ناشارێتەوە، خەڵك لەدەستی ئاسودەن، بەڵام لەدەست دەرونی خۆی زۆر ماندووە، لە گوفتاردا ڕاستگۆیە، دەستپاكی ڕاسپاردەیە، لێبوردەی ستەمە، چاكەكاری هەمبەر خراپەیە .
هەروەها ئەوەش بزانە كوڕەكەم كە مرۆڤی خراپ كاتێك قسە دەكات ئابڕوی دەچێت، كە كاردەكات خراپە دەكات، كاتێك دەوڵەمەند دەبێت ستەم دەكات، كاتێك هەژار دەبێت بێ ئومێد دەبێت، كاتێك خەمبار دەبێت بێ هیوا دەبێت، كاتێك داوای لێبكەی چاوچنۆك دەبێت، كاتێك پێی ببەخشرێت سوپاسگوزار نابێت، كاتێك لێی ون دەبی زەمت دەكات،
گوتی: بەڵێ باوكە..
گوتی: نە دانایی خۆی بە كەڵكی دێت، نە دانایی خەڵكی سودی پێدەگەیەنێت..
زۆر سەرسامە بە دانایی خۆی ئەگەر وەكو دانایانیش نەبێت، سەرسامە بە زانستی خۆی ئەگەر وەكو زانایانیش نەبێت، تەنیا بۆ ئەوە ڕاستی

دەڵێت تا سوپاسی بکرێ.
ئەگەر زانابیت لە زانایی‌یت کەم دەکاتەوە، ئەگەر نەزان بیت گاڵتەت پێدەکات.
کەمێك بێدەنگ بو، پاشان بە دەنگێك کە کوڕەکەی هەستی کرد کە قسەی کۆتاییەتی گوتی:
کوڕەکەم، من حەوت هەزار پەند فێر بووم، تۆ تەنیا چواریان فێر ببە و لەگەڵمدا وەرە بۆ بەهەشت.
کەشتییەکەت باش ئامادە بکە، چونکە دەریا قووڵە.
بارت سوك بکە، چونکە ڕێگا ناخۆشە .
با توێشوی زۆرت پێبێت، چونکە ڕێگا دوورە .
لە کارەکانتدا ورد بە، چونکە ڕەخنەگر وردبینە .
کوڕەکەم، پێشەوای ڕەوشتی دانایی دینی خوای گەورەیە .
نمونەی دینی خواش وەك درەختێك وایە؛ باوەڕ بە خوا ئاوەکەیەتی، نوێژ ڕەگەکانیەتی، زەکات قەدەکانیەتی، برایەتی خوایی پەلەکانیەتی.. ڕەوشتی جوان گەڵاکانیەتی.. گوێڕایەڵی خواش بەروبومەکەیەتی..
درەختیش بەرهەمی خۆش نەبێت تەواو نییە،
ئایینیش بە دەرچون لە قەدەغەکراوەکانی خوا نەبێت تەواو نابێت .

* * *

## بەشی دوازدەهەم

لە شەودا، کاتێك لوقمان لەسەر کارەکەی بو، (نادان)ی کوڕی بینی بە شپرزەیی خۆی کرد بەژوردا: باوکە دایکم لە مەترسی دایە، چوم بە پوریشمم گوت و ئێستا لەگەڵ مامە ئەیوب لەوێن.
بیری کەوتەوە کە پێشتر دەربارەی نەخۆشییەکەی پێی گوتبو، دەرگای دوکانەکەی داخست و بە پەلە لەگەڵ کوڕەکەیدا بەرەو ماڵ بونەوە.
تایەکی زۆر دایگرتبو، بە ئەستەم دەیتوانی قسە بکات.
کاتێك دەستی خستە سەر نێو چاوانی، وردە وردە فرمێسك لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە.
ئەوە (سادر)ە، ئەو ئافرەتەی لە هەمو خۆشی و ناخۆشییەکدا لەگەڵیدا ئارامی گرتووە، ئەو ئافرەتەی توانی ئەو لایەنەی ژیانی ئەو پیاوە ڕوناك بکاتەوە کە هیچ کەسێك جگە لە هاوسەر ناتوانێت ڕوناکی بکاتەوە.
ئێستا لە دەرونی خۆیدا دەڵێت: من لە بەرانبەر ئەو خزمەتەی ئەودا چیم پێشکەش کردووە؟!
هیچ، هیچ، هیچ شتێك ئەی لوقمان.
ئێستا دەرك بەوە دەکات کە ئافرەت ڕۆڵێکی چەند گرنگ دەگێڕێ لە ڕۆشن کردنەوەی ژیانی پیاودا.
هەروەها ئەوەی کە پیاو هەرچەند هەوڵ بدات ناتوانێت قەرەبوی چاکەکانی ئافرەت بداتەوە، بەڵێ ئافرەتی باش یەکێکە لە بەخششەکانی خوا کە پێتی بەخشیوە، تۆ لە هەمبەر ئەو نیعمەتە جگە لە خشوع بۆ

خوا، لێبوردەیی بۆ خەڵك، ڕاستگۆیی، خۆشەویستی چیت لە دەست دێ؟!
ئەی مرۆڤ تۆ هیچت نییە بە خوای ببەخشی و هەرچی هی تۆشە هی خوایە !
ئەگەر دەتەوێ سوپاسگوزاری بۆ خوا بنوێنی سودبەخش بە بۆ خەڵکی..
درەنگانی شەو خوشکەکەی و ئەیوبی هاوسەری گەڕانەوە ماڵی خۆیان.
لوقمان و دو کوڕەکەی تا بەرەبەیان بەدیار هاوسەرەکەیانەوە دانیشتن، هیچ دەرمانێکی گیایی و سروشتی نەما پێی نەدات، بەڵام هیچ سودی نەبو.
لەگەڵ ڕوناك بونەوەی دنیادا هاوسەرەکەی گوتی: وادیارە من بەجێتان دێڵم، چی دەربارەی ئەو مردنە دەزانی کە خەریکە بۆی دەڕۆم ئەی لوقمان ؟!
دەستی خستەناو دەستییەوەو بە هێمنی گوتی:
پێشبینی و خەیاڵی بیرو هۆشمان زۆر جار لە ڕاستەقینە و کردار دوورن، خەیاڵ زادەی بیروهۆشی خۆمانە، بەڵام واقیع بەرهەمی ئەو کردارانەیە کە لەناکاو ڕوودەدەن.
هەندێ کەس بۆ پرسی مردن و ژیانی دوای مردن تێڕوانینێکی خەیاڵی هەیە و هیچ پەیوەندی بە واقیعەوە نییە، چونکە تێیدا نەژیاوە، ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە کە هەندێ کەس تێی دەکەون، تەنانەت لەوانەیە بگاتە ئاستی مردن لە ترسی مردن ! چونکە لەدیدی ئەوەدا مردن بریتییە لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاوی گۆڕێکی چۆڵ، ڕاکشان بۆ هەتایە لە چاڵێکی قوڵدا و لە ژێر خاکدا.
هەروەها لە بەرانبەردا هەندێ کەسی بە ئومێد خۆیان لە بەهەشتدا

دەبیننەوە، کە جگە لە خواردن و خواردنەوەو جوتبون هیچی تری لێنەبێت، ئەمەش جیهانێکی بێزارکەر نیشان دەدات.
ئەم دو چەمکە هیچ پەیوەندییەکیان بە واقیعەوە نییە، چونکە هێشتا هەر زادەی خەیاڵن و لە ڕاستیدا تێیاندا نەژیاوە.
مرۆڤ لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانکاری بەسەردا دێت، تەنانەت خەیاڵیشی دەگۆڕێت. هەر قۆناغێکی تەمەن بیرکردنەوە و خەیاڵی تایبەتی خۆی هەیە. ئەمانە هەموی خەیاڵن و جیاوازن لەوەی کە لەدوای ژیانی دنیادا ڕوودەدەن، بەڵام دەکرێ باوەڕ هەندێك لەو واقیعە کە ڕوی نەداوە بۆ مرۆڤ پێشی بخات و نیشانی بدات.
گومانی باش نەبردن بەخوا و بە ڕەحمەتی فراوانی وا لەو کۆمەڵەیە دەکات کە حەز بە دیداری خوا نەکەن، چونکە لە خەیاڵیاندا لەو دیدارەدا جگە لە سزا و ئەشکەنجەدان هیچی تری تێدا نییە، خۆ ئەگەر لە ڕاستیدا وابووایە، ئەوا کەس حەزی بە دیداری خوا نەدەکرد، چونکە هیچ مرۆڤێکی بێ تاوان نییەو خوا مرۆڤی وا دروست کردووە، کە تاوان بکات و هەڵێکی تری پێبدات وەك ئەوەی هیچ تاوانێکی نەبوبێت، وەك ئەو کەسەی کە لەشگرانە و کاتێك خۆی دەشوات و پاك دەبێتەوە وەك ئەوەی کە هەر لەشگران نەبوبێت.
هاوسەرەکەم، لەڕاستیدا مردن بێداربونەوەیە لە خەوی ژیان، چونکە ژیانی دوای ژیان زۆر پاکتر و جوانترە، تا ڕاددەیەك کە مرۆڤ خۆیشی شێوەیەکی بەهێزتر و جوانتری دەبێت..ئەوکات دەرك بەوە دەکات کە خەوتو بووەو ئەو ژیانەی کە لەدیدی ئەودا پڕ خۆشی بو و لەوە دەترسا کە لەدەستی بچێت ئێستا لە بەرانبەر ژیان و بێداری گەورەدا بۆتە خەون، مرۆ ڤیش ناتوانێت هەست بەو بێزارییە بکات تا بە وێستگەی مردندا تێنەپەڕێت و مردن دوبارە داینەڕێژێتەوە تا شیاو بێت

بۆ ئەوەی بەرگەی بینینی خوا و زانینی ڕاستییە گەورەکان بگرێت .
دوای ئەوەی دنیا تاریك داهات ئافرەتەکە دوایین هەناسەکانی ژیانی هەڵدەمژی، لەکاتێکدا دەستی لە دەستی گیرکردبو و دەیگوشی و دوایین وشەکانی ژیانی دەردەبڕین: لوقمان، داوات لێدەکەم لە کەموکورتییەکانم ببەخشی.
ئەی لوقمان ئەوە ئەزمونێکی نوێیە؛ ئەزمونی مردن؛ مردنی نزیکترین کەسی ژیانت.
مردنی هاوسەری تەمەن، هاوڕێی تەمەن، مردنی ئەو کەسەی نیوەی ژیانی ڕوناك کردبیەوە.
دە ڕۆژ دوای پرسەکە، لوقمان بەپێویستی زانی، کە دوای ئەو ڕوداوە ئەو شوێنە جێبهێڵێت، هەوایەکی نوێ هەڵمژێ، شوێنێکی نوێ، خەڵکێکی نوێ ببنێت، ئەوکات چەند شتێکی نوێ فێردەبێت.
لە غوربەتدا دانایی بەناو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە.
یەکە یەکە ماڵئاوایی لە دراوسێکانی کرد، تەنانەت(سیراخ)یش، پێی گوت: دراوسێکەم، ئەگەر بەبێ ویست و ئاگایی خۆم ئازارێکم پێگەیاندبی داوای لێبوردنت لێدەکەم.
سیراخ گوتی: چونکە بەجێمان دێڵی، لێت دەبورم، ئافرەتەکەشت کە هێرشی کردبووە سەر ئافرەتەکەم بۆلای خوا گەڕاوەتەوە.
لەگەڵ هەردو کوڕەکەی شەو لە ماڵی ئەیوبدا مانەوە، تا ماڵئاواییان لێبکەن.
بەیانی زو دەرگای ماڵەکەی گاڵەدا و لەگەڵ هەردو کوڕەکەیدا بەرەو ژیان و جیهانێکی نوێ بەڕێکەوتن..
ڕۆژ دوای ڕۆژ شتی نوێ فێر دەبو..
سەرنجی ئەوەی دەدا، کە چۆن جەشتەش لەگەڵ درۆکردندا ناتارامە.
چۆن ڕۆح لە ڕوبینی بێزارە، کاتێك کەسێك خەریکە درۆ دەڵێت، لە

ڕەنگ و ڕویدا دەردەکەوێت، لە لەرە لەری دەنگیدا هەستی پێدەکرێ، لە جوڵەی لێوەکان، سەرنجی چاوەکان، جوڵەی دەستەکانی..کاتێك مرۆڤ خەریکە درۆ دەڵێت هەمو ئەندامەکانی هاواردەکەن: من لەوە بێبەریم..تۆ درۆ دەکەی !

مرۆڤ ڕاستگۆیی پێ ڕاسپاردەکراوە.

کاتێك مرۆڤ ڕاستی دەڵێت وشەکانی بەهێز و متمانەوە لەدەم دێنەدەر، وەك دوڕ و مەرجان دەدرەوشێتەوە، سنگی فراوان دەبێت.

هەر وشەیەك کە بەڕاستی لە دەم دەربچێت سوپاسی خاوەنەکەی دەکات، کە بەڕاستی دەریبڕیوە..

ئەوە ژیانە؛ یەکێکیان باس لە کۆژانەکانی خۆی دەکات، لەسەر ئەوەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ سێ ئافرەتدا کردووە و هێشتا نەبۆتە باوك، ئەوی دیش باسی بەخششی باوکایەتی دەکات !

یەکەمیان مرۆڤێکی بێ ئارام بووەو نەیتوانیوە لەسەر هاوسەرەکەی ئارام بگرێت بۆیە لە بەرامبەردا هاوسەرەکەشی ئارامی لەسەر نەگرتووە، لەگەڵ هەمو هاوسەرەکانی هەمان هەڵەی دوبارە کردۆتەوە، لەبەرئەوە هیچیانی لەلا نەماوەتەوەو هەمویانی لەدەستداوە، بەمەش بەدەست ئازاری بێ منداڵییەوە دەناڵێنێ !

هەرچی دووەمیانە کەسێکی ئارامگر بووەو مەبەست و نهێنییەکانی هاوسەرگیری زانیوەو هەوڵی پەروەردەکردنی هاوسەرەکەی داوەو بەمەش لەگەڵیدا ماوەتەوەو بۆتە خاوەنی منداڵ..

لوقمان هەر ڕۆژە بەرەو ئاڕاستەو شار و بیابان و ناوچەیەکی نوێ دەڕۆیشت، تا دانایی بەناو خەڵکدا بڵاو بکاتەوە..

نیوەڕۆیەك

، کاتێك لەژێر سێبەری درەختێکدا پاڵکەوتبون، تا دوای ئەو ڕێیە دووره پشویەك بدە، (ساران)ی کوڕی هاواری کرد..

لوقمان و نادان له خەو ڕاپەڕین
(ساران) توند قاچی گرتبو، گوتی: باوکە مار پێوەی دام..
لوقمان بینی مارەکە بەناو پوش و پەلاشدا دەخشێت.
لوقمان دەمی خستە سەر شوێنی پێوەدانەکەو دەستیکرد بە مژینی ژەهرەکە، بەلام ئەوە هیچ سودێکی نەبو و خەریك بو لە باوەشیدا دواین هەناسەکانی ژیانی دەدا..
هەر لەوێ بەخاکی سپارد و بەردەوام بو لە ڕۆیشتن بە کۆلێك خەمی نوێوە، بە هیوای لەیاد کردنی..بەلام چۆن بتوانێت ئەو کوڕەی لەیاد بکات کە بە درێژایی ئەو سالانە هاوڕێیەتی کردووە، مالئاواییەك کەتاقیامەت دیداری دوبارەی نییە..
لەسالێ دەیەمی دەربەدەریدا، کە لە ولاتی شام بو، کەسێك هاتەلای و پێی گوت، کە پاشای ولات داوای کردووە بیبینێت.
لوقمان لە چون بۆلای پاشا دوانەکەوت..
پاشا گوتی: زانیومانە کە تۆ مرۆڤێکی دانای، بۆیە تۆمان بانگ کردووە تا حوکمی سزای زینا و دزیمان بۆ بدەی..
لوقمان داوای هەندێك کاتی کرد تا بتوانێت بڕیارێکی دروست بدات، دوای شەش ڕۆژ لوقمان هات تا لە بەردەم پاشا حوکمەکە ڕابگەیەنێت..
پاشا گوتی: خوا سەرفرازت بکات ئەی لوقمان، ئەوە یاسایەکە، کە کەس بەر لە تۆ نەیچەسپاندووە، لەمەولا لە ولاتەکەماندا کار بەو یاسایە دەکەین.
پاشان داوای لە لوقمان کرد کە ببێتە ڕاوێژکاری تایبەتی ئەو، لوقمانیش پێی ڕاگەیاند کە ئامادەیە ببێتە ڕاوێژکاری، چونکە تازە لەو ولاتەدا نیشتەجێ بووە .
هەستی بە پێویستییەکی زۆر دەکرد بۆ ئافرەتێك کە لە تەنیشتییەوە بێت، ئارەزوی مندالێ دەکرد..

لەگەڵ یەکێك لە خەڵکی ئەو ناوچەیە قسەی کرد، ئەویش پێی گوت، کە یەکێك لەو ماڵانەی ئەو ناوچەیەدا بێوەژنێك هەیە بە ناوی (تارح).
لوقمان لەگەڵ (نادان)ی کوڕی چون بۆ ئەو ماڵە، تا داخوازی ئافرەتەکە بکەن..
باوکی ژنەکە گوێی لە لوقمان گرت، پاشان چووە لای کچەکەی تا ڕای وەربگرێت..
دوای ماوەیەك ئافرەتەکە هەندێك خواردنەوەی بۆ هێنان، لەگەڵ لوقماندا نیگایان گۆڕییەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ ژورەکەی..
باوکەکە چو دەربارەی پیاوەکە پرسیاری لیٚ بکات و ڕای وەربگرێت..
لەوکاتەوە، لەشەوی یەکەمی هاوسەرگیرییاندا ئافرەتەکە باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو ئافرەتێکی بەختیارە بەوەی خوا هاوسەرێکی دانای بە قسمەت کردووە، کە هەمو خەڵکی زەوی باسی ئەویان لەسەر زارە..
سەرنجی لێوە ئەستورەکانی دەدا، بەڵام ئەو وتەیەی بەبیردا دەهات کە دەڵێت:
ئەو لێوە ڕەشانەی دەیانبینی قسەی سپییان لێوە دێنەدەر!
لێی پرسی: ئەی لوقمان لە چ کەسێك فێر بوی؟
گوتی: لە کەم ڕەوشتان!
گوتی چۆن؟
گوتی: هەر کاتێك کەسێکم دەدی کە ڕەفتارێکی ناشرینی دەکرد، من هەوڵم دەدا ئەو هەڵەیە دوبارە نەکەمەوە، تا لەچاوی خەڵکدا وەك ئەوان دەرنەکەوم.
گوتی: خەڵك ڕاست دەکەن، کە دەڵێن دانای!
پاشان گوتی:
چ زانستێك لە هەمو زانستەکان گرنگترە؟
گوتی:

وازهێنان لەو شتەی پەیوەندی بە تۆوە نییە !
گوتی: بۆچی دانایيت بەسەر پێغەمبەرایەتیدا هەڵبژارد، لە کاتێکدا خوا سەرپشکی کردی؟
گوتی: ئەگەر خوا بەناچاری پێغەمبەرایەتی پێ سپاردبام ئەوا بە پشتیوانی ئەو دەمتوانی بە کارەکەم هەڵبستم، بەڵام سەرپشکی کردم، منیش دانایيم لەلا خۆشەویستتر بو.
پاشان گوتی: خوا یارمەتی دانایان دەدات و تەنیا ئەوەیان بەسەر زوباندا دێت، کە خوا بۆیان ئاسان دەکات.
گوتی: ئامۆژگاری چیم دەکەی؟
گوتی:
با تەنیا لەخوا ترسەکان خواردنت بخۆن، و لەکارەکانتدا ڕاوێژم پێبکە..
لەگەڵ ئافرەتی نەفامدا دۆستایەتی مەکە، تا وانەزانێت کە تۆ کارەکانیت بە دڵە
واز لە خراپە بێنە وازت لێدێنێت، چونکە خراپە بۆ خراپە دروستکراوە.
ئەوەش بزانە کە خوا بەڕوناکی دانایی دڵە مردووەکان زیندو دەکاتەوە، هەروەك چۆن باران زەوی مردو زیندو دەکاتەوە.. گواستنەوەی بەردی گەورەش لەشوێنی خۆی ئاسانترە لە تێگەیاندنی ئەو کەسەی تێناگات،
پاشان لێی نزیك بووەوەو بە زەردەخەنەوە پێی گوت:
- لەم شەوی هاوسەرگیرییەماندا ئازیزەکەم، بزانە کە ئەگەر قسەکردن زیو بێت بێدەنگی زێڕە .

* * *

# بەشی سێزدەهەم

لەگەڵ تارح و نادان بە زەویدا دەگەڕان، بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە ڕەملە و حەیفا و تەبەڕییە مانەوە..
دوای ئەوە بەرەو یەمەن کەوتنەڕێ، لە ڕێگادا بایەکی بیابانی توند هەڵیکرد، بەهۆی تۆز و خۆڵەوە (نادان)ی کوڕی خنکا..
لە یەمەن ناشتی، پاشان بەرەو میسر کەوتنەڕێ و دو ساڵ تێیدا مایەوە، لە هاوسەرە نوێکەی منداڵێکی نوێی بو ناوی نا(ناران).
جارێکی دی هەست و سۆزی باوکایەتی بۆ گەڕایەوە، کوڕەکەی لە باوەش دەگرت، دو کوڕەکەی تری وەبیر دەهاتنەوە، کە لە دەستی دابون، وای هەستدەکرد، کە خوا بە (ناران)بۆی قەرەبو کردونەتەوە، هەروەك چۆن هاوسەرەکەیشی بە(تارح) قەرەبو کردۆتەوە.
نەفس شوێنکەوتەی ئاڕاستەکردنی خاوەنەکەیەتی، هیچ نەفسێك نییە نەچێتە ژێر فەرمانی خاوەنەکەی، نەفس وەکو ئافرەت وایە؛ئافرەتە ئەگەر مێردەکەی پیاو بێت، پیاوە ئەگەر مێردەکەی ژن بێت !
نەفس لە بەردەم خاوەنی بەهێزدا بەڕێز و هێمن و بێهێز دەردەکەوێ.
لە بەردەم خاوەنی بێهێزیشدا، سەرکەش و نائارام و بەهێز دەردەکەوێ..
نەفس کلیلێکە بەدەست خاوەنەکەیەوە..
ئارامگرتن لە هەمو کاتێکدا پێویستە، هەندێ کات نیگایەك پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، وشەیەك پێویستی بە کات هەیە، ناسینی کەسێکی نوێ پێویستی بە کات هەیە تاکو وەکو هاوڕێ قەبولی دەکەی، تەنانەت لەخەو هەستانیش پێویستی بە کات هەیە تا دەتوانی لەسەر

قاچەکانت بوەستێ .
نیگای خێرا لەوانەیە کوێرت بکات، قسەیەکی بە پەلە لەوانەیە لەسەرت هەژمار بکرێ، هەنگاوی خێرا لەوانەیە بەرەو هەڵدێرت ببات، ئەو کەسەی لە دیداری یەکەمەوە بە خێرایی دەیکەیتە هاورێت لەوانەیە توشی نەهامەتیت بکات، هەستانی خێرا لە خەوتن لەوانەیە بە درێژایی ڕۆژ توشی دڵەڕاوکێت بکات.

هەمو دەرونێك پێویستی بە ئارامی و ڕاهاتن هەیە؛ ڕاهاتن لەسەر ئازایەتی، لەسەر ترسنۆکی، لەسەر دەستکراوەیی، لەسەر چاوچنۆکی، لەسەر ڕێکخراوەیی لەسەر بێبەرنامەیی، لەسەر چاکە، لەسەر خراپە، لەسەر چالاکی، لەسەر تەمەڵی..

ویستی خوا وابووە ئادەم میانڕەو بێت و هێزی یەکسانی هەبێت، تا لەگەڵ قۆناغە جیاجیاکانی ژیان بگونجێت..

ئیتر ئەو باپیرەیە هەمو شتێکی بۆ نەوەکانی دوای خۆی جێهێشت، ئەوانەی دێن و سەرزەمینی خوا پڕ دەکەن و لە ڕووەکەکانی دەخۆن و لە ئاوەکەی دەخۆنەوە.

تەنانەت ئەگەر یەکێك لەو نەوانەی بە تەنهاش بێت، ئەو میراتە نورانییەی پێدەگات و یارمەتی دەدات تا ژیانێکی ئارام بژی.

ئەو نەوەیە توانای جۆراوجۆر و سەرسوڕهێنەری بەبەردا کراوە، دەتوانێت زمانە جیاجیاکان فێر ببێت و پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤە جۆراوجۆرەکاندا ببەستێت..

هەر شتێك کە خوا بە مرۆڤی بەخشیوە بۆ خزمەتکردنیەتی و هیچ شتێکی بۆ بێزارکردنی نییە، بەڵام ئەو نیعمەتانە ئەگەر بۆ مەبەستی خۆیان بەکارنەهێنران، ئەوکات مرۆڤ بێزار دەکەن !

ئەمە بۆ ئەوەی مرۆڤ پارێزگاری لە میانڕەوی خۆی بکات و بەشێوەیەکی سروشتی بژی..

هەمو کات خێر لە میانڕەوی دایە..
کاتێك مرۆڤ شتێك لەسەر خۆی قورس دەکات خواش لەسەری قورس دەکات، چونکە ئەو خۆی قورسی هەڵبژاردووە، بەڵام ئەگەر کارەکانی لەسەر خۆی سوک بکات خواش لەسەری سوك دەکات..
هێمنی ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێت، بەڵام هەڵەشەیی مرۆڤ توشی دڵەڕاوکێ و دەمارگیری دەکات..
هەمو شتێك دروستکاروی خوایەو هیچ شتێك بەبێ خوا نەهاتۆتە بون..
تۆ دەبینی، دەبیستی، بۆن دەکەی، لەبەرانبەردا کەسی وا هەیە نابینێت نابیستێت بۆن ناکات.
تۆ لەسەر قاچەکانت دەڕۆی، لەبەرانبەردا کەسی وا هەیە لەسەر یەك قاچ دەڕوات، مرۆڤی وا هەیە لەو بەخششە بێبەشە..
ئەگەر مرۆڤی ژیر و زیرەك ببینی، مرۆڤی نەفام و کلۆڵیش دەبینی..
ئەگەر بینیت هەنگ شیلەی گوڵێك دەمژێت تا بیکاتە شیفا، لە بەرانبەریشدا مێشولەیەك دەبینی کە تەنیا لەسەر پیسی دەنیشێتەوەو تەنانەت لەوانەیە بە یەك دەستلێدانیش توشی نەخۆشیت بکات..
ئەگەر هەنگ نەبوایە، مێشولەش نەدەبو، ئەگەر گێل نەبوایە ژیریش نەدەبو، ئەگەر شەو نەبوایە، ڕۆژیش نەدەبو، ئەگەر ژیان نەبوایە مردنیش نەدەبو..
هیچ شتێك وەکو باوەڕ مرۆڤ بەرز ناکاتەوە، هەرچەند مرۆڤ باوەڕی زیاتر بێت و زیاتر شارەزا بێت، زیاتر بەرز دەبێتەوە.
هەرچەند مرۆڤ کاری باش بکات باوەڕی زیاد دەکات، هەرچەند کاری خراپیش بکات باوەڕی کەمدەکات، چاکە بریتییە لە خزمەتکردنی خەڵك و خراپەش زیان گەیاندنە پێیان..
ئەگەر خوا منداڵێکی پێبەخشی بیپارێزە، چونکە ڕاسپاردەی خوایە و

ڕاسپاردەی خواش بپارێزە..
ئەگەر کرێکارێك لەلات ئیشی کرد ڕێزی بگرە، چونکە خوا ڕۆزییەکەی ئەوی بەتۆ ڕاسپاردووە و فەرمانی پێکردووە کارێکت بۆ ڕاپەڕێنێت، بۆیە بەر لە وشك بونەوەی ئارەقەکەی کرێکەی پێبدە..
مرۆڤی چاك مەیلی کۆمەڵێکی چاك دەکات، مرۆڤی خراپیش مەیلی کۆمەڵێکی خراپ دەکات، مرۆڤی چاك مەیلی هاوڕێیەتی چاك دەکات، مرۆڤی خراپیش مەیلی هاوڕێیەتی خراپ دەکات..
هەروەك چۆن ڕاستگۆیی پلەی ڕاستگۆ بەرز دەکاتەوە و چاکە پلەی چاکەکار و دڵسۆزی پلەی دڵسۆز، لەبەرانبەریشدا درۆ درۆزن ڕیسوا دەکات و خراپەش خراپەکار و دوڕوییش دو ڕو..
هەر کەسێك خراپە بکات دەبێ چاوەڕێی ئەوەش بکات کە ئەو خراپەیەی دێتەوەڕێ، هەر کەسێك لەگەڵ دایك و باوکی خراپ بێت، منداڵەکانی لەگەڵیدا خراپ دەبن. ئەمە ڕێسای نەگۆڕی خوایە لە زەویدا..

* * *

# بەشی چواردەهەم

لەپڕ بیری ئەو ڕۆژانەی دەکرد کە لە خانووە بچکۆلە داخراوەکەیدا بەسەری برد و گرنگترین کاریگەری لەسەر ژیانی هەبو، ئارەزوی دەکرد بگەڕێتەوە بۆ زەوی هیوا..

لەو کاتانەدا (ناران)ی کوڕیشی لەدەستدا، کە تەمەنی شەش ساڵان بو.. چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسك و بە هاوسەرەکەی دەگوت کە ئارام بێت و دەیگوت: خوا پێی بەخشین و هەر ئەویش بۆلای خۆی بردیەوە، لە خوداوە بۆمان هات و بۆلای ئەویش گەڕایەوە، سوپاس بۆ خودا کە پێی بەخشین و ڕازین بە قەدەری خوا..

دوای ئەو قسانە قورگی پڕ بو لە گریان و چی دی قسەی پێنەکرا..

دوای ئەو ڕوداوانە لوقمان وای هەستدەکرد، کە زیاتر پێدەگات و لە داناییدا قوڵتر دەبێتەوە و زیتر خەڵك و ژیان دەناسێت، هەرکاتێك کارەساتێکی توش بوایە باوەڕی پتەوتر دەبو.

لەڕێگادا کە بۆ خانووەکەی پێشویان دەگەڕانەوە هاوسەرەکەی منداڵێکی تری بو ناوی نا(ساران) هەمان ناوی کوڕەکەی یەکەمی لێنا..

وردە وردە لەو زەمینە پڕ خێر و بێرە نزیك دەکەوتەوە، دوای دابڕانێکی زۆر بەرەو زێدی شیرینی گەڕایەوە..

کاتێك نزیك کەوتەوە بینی خەڵك پۆل پۆل بۆ پێشوازیکردنی دەهاتن، ماوەی بیست ساڵە لێی دوورن، پەروەشی ئامۆژگاری و داناییان کردبو..

لەهەمو لایەکەوە خەڵك دەهاتن بۆ سەردانی، پرسیاری دەربارەی ئەیوب کرد، گوتیان ئەوە دو ساڵە مردووە، زۆر بۆی دڵتەنگ بو، دوای

تێپەڕبونی دوو مانگ بڕیاریدا بگەڕێتەوە سەر پیشەی دارتاشی..
نیوەشەو لایدابو، ئەو هێشتا لەنێو زادەی خەیاڵدا دەخولایەوە..
لەناو گەرمادا شنەبایەکی فێنك هەڵیکرد، بیری لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە دەکردەوە..
دەستەکانی لەیەك دورکردنەوە و باوەشی بۆ شنەبا واڵا کرد و چێژی وەردەگرت، لەپڕ چاوی کەوتە سەر هاوسەرەکەی کە لە تەنیشتییەوە پاڵ کەوتبو..
ئارەزوی دەکرد لە باوەشی بگرێت، بەڵام نەیویست لە خەوی بکات..
دوبارە بیری لە نیعمەتی هاوسەرگیری دەکردەوە کە نیعمەتی هاوسەرگیری فەراهەم کردووە..
ئەو ئافرەتە خێزانەکەی و زێدی خۆی جێهێشتووە و ڕازی بووە بەوەی پیاوێك ببێتە هاوسەری، باوکی، بەخێوکەری..
بۆ ساتێکیش بیرت نەچێت کە تۆ هەژاری بۆ دەوڵەمەندی خوا، بێهێزی بەرانبەر هێزی خوا، نەزانی بەرانبەر زانستی خوا. وردە وردە خەو زۆری بۆ دەهێنا، تا لەناو ئەو خەیاڵانەدا نقوم بو و خەوی لێکەوت.
ئەو پیاوەی سەدەو نیوێکی ژیانی تێپەڕاندووەو هێشتا نازانێت ماندوبون چییە !
لەگەڵ بەرەبەیاندا دەچووە سەر کارە قورسەکەی و تا تاریك دادەهات هەر لەسەر کارەکەی دەمایەوە، هەرکاتێکیش لە دارتاشیدا کاری نەبوایە دەچووە سەر کاری بەرگدرویی، هەندێ جاریش کاری شوانەتی دەکرد..
ئەوی گرنگ بو لەلای ئەوەبو کە هیچ ڕۆژێك تێنەپەڕێت کە کارێکی تێدا ئەنجام نەدات، یان سودێك بە کەسێك، ئاژەڵێك، ڕووەکێك نەگەیەنێت.
کاتێك هاوسەرەکەی پێی دەگوت، کە تۆ تەمەنت زۆرەو پێویستت بە پشودان هەیە، دەیگوت:

خۆشترین پاروە نان کە چوبێتە قورگمەوە ئەوەبووە کە بە زۆرترین ماندوبون دەستم کەوتووە. خۆشەویستترین جلوبەرگیش ئەوە بووە کە بە ئارەقی نێوچاوانم کڕیومە، پاکترین پارەش کە هێنابێتمە ماڵەوە ئەوە بووە کە زۆرترین ماندوبونم پێوە چەشتووە..

پێی دەگوت کاتی خەوتنیش دێت، خەوتنێکی دووروودرێژ، کە مرۆڤ هەمو ماندوبونێکی لەیاد دەکات و ئەگەر هەمو تەمەن بە کارکردن و ماندوبونی بێ پچڕانەوە و بێ خەوتن بەڕێ بکات هێشتا بە بەراورد بەو خەوتنە لە کاتژمێرێك زیاتر نییە..

ڕۆژە پڕشنگدارەکانی بیردەکەوتنەوە:

ڕۆژێکیان دوای ماندوبونێکی زۆر بۆ ئەوەی زۆرترین کار بکات و پارەیەکی باشی دەستکەوێت، لە ڕێگای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە پیرەپیاوێکی دی پێی گوت کە منداڵەکانی لە برسا دەناڵێنن و لەبەریان ڕایکردووە، ئەویش نیوەی کرێی ئەو ڕۆژەی پێدا تا خواردنیان بۆ ببات..

کاتێك لە ماڵەوە نزیك بووەوە بینی دو لە دراوسێکانی دەمەقاڵێیانە کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە بینی لەسەر قەرزێك کە کاتی دانەوەی هاتووە دەمەقاڵێیانە، ئەویش هەرچی مابووەوە لە پارەکەی دای بە خاوەن قەرزەکەو ئاشتی کردنەوە..

ئەوەی وابزانێت ژیان مرۆڤی خراپی تێدا نییە، وەك ئەوە وایە وابزانێت کە ژیان مرۆڤی چاکی تێدا نییە.

جیاوازی نێوان چاکەکار و خراپەکاریش ئەوەیە کە چاکەکار دەتوانێت بە هەڵوێستە جوانەکانی کەسێکی خراپ چاك بکات، خراپەکاریش بە هەڵوێستە خراپەکانی چاکەکار پێداگرتر دەکات لەسەر سوربون لەسەر کاری چاکە.

* * *

# بەشی پازدەهەم

تەنانەت لە ڕۆشتنیشی لە خەڵك جیاواز بو، هەموان سەرنجیان دەدا، ئاماژەیان بۆ دەکرد و دەیانگوت:
سەیرکەن ئەوە دانای زەوییە !
کاتێك بەڕێگادا دەڕۆیشت سڵاوی لە هەمو کەسێك دەکرد..
هەندێك جار کە دەیدی کەسێك زۆر سەرنجی دەدات، دەچووە پێشی، سڵاوی لێدەکرد و پێی دەگوت:
ئەگەر سەرنجی ڕەشی پێستم دەدەی، بزانە دڵم سپییە !
کابرا ئەوەی بە هەلزانی و لیی پرسی:
ئەی دانا چ زانستێك لە دەرونتدا زۆر کاریگەری هەبووە؟
گوتی: وازهێنان لەوەی پەیوەندی بە منەوە نەبووە.
کەسێکی تر پرسیاری لێکرد: چ جۆرە مرۆڤێك خراپە؟
گوتی: ئەو کەسەی گرنگی بەوە نادات کە خەڵك بە خراپی ببینن.
دوای ساتێك بێدەنگی گوتی: هاوڕێیەتی گەمژە مەکە، ئەگەر بە شێوە جوان و سەرنجڕاکێشیش بێت، سەیری شمشێر بکە چەند جوان و سەرنج ڕاکێشە!
سێ کەس لە دوورەوە هاتن، هەر نزیك کەوتنەوە یەکێکیان گوتی:
کام سیفەت بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە؟
هەڵوەستەیەکی کرد، پاشان گوتی:
ئایین..
کابرا گوتی: ئەگەر دو شت بن؟

گوتی: ئایین و سامان.
کەسی دووەم گوتی: ئەگەر سێ بن؟
گوتی: ئایین و سامان و ئابڕو.
کابرا گوتی: ئەگەر چوار بن؟
گوتی: ئایین و سامان و ئابڕو و ڕەوشت.
کەسی سێیەم گوتی: ئەگەر پێنج بن؟
گوتی: ئایین و سامان و ئابڕو و ڕەوشت و بەخشندەیی.
کابرا گوتی: ئەگەر شەش بن؟
گوتی: هەر کەسێك ئەو پێنج شتەی هەبن، کەسێکی پاك و چاکە و دۆستی خوایە..
ئەمەی گوت و کەوتەڕێ، لەوکاتەدا کەسێك دوای کەوتبو و لە دوورەوە گوتی:
ئەی لوقمان ئامۆژگاریم بکە..
لوقمان کەمێك وەستا تا کابرا گەیشتەلای، پاشان گوتی: سوپاسگوزاری ئەو زاتەبە کە نیعمەتی بەسەردا ڕشتوی، چونکە هەر نیعمەتێك سوپاسی لەسەر نەکرێت بەردەوام نابێت..
لەو کاتەدا کۆمەڵە خەڵکێکی تر هاتنەلای، پیاوێك کە وادیاربو دەیویست لوقمان توڕە بکات، گوتی: ڕوخسارت زۆر ناشرینە لوقمان!
لوقمان توڕەبو، بەڵام توڕەییەکەی خواردەوە، بەڵام پیاوەکە پرسیارەکەی دوبارە کردەوە..
لەو کاتەدا لوقمان هاتەدەنگ: تۆ عەیب لە نەخش دەگری یان لە نەخشێنەر؟!
کابرا بێدەنگ بو، پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، لەوکاتەدا پیاوێك هاتەپێش و گوتی:
تۆ لوقمانی، تۆ بەندەی هۆزی (حەسساس)ی؟

گوتی: بەڵێ.
گوتی: تۆ شوانە ڕەشەکەی؟
گوتی: هەرچی ڕەشییەکەمە ئەوە خۆ دیارە، فەرمو چی سەرسامی کردوی؟
گوتی: خۆشەویستی خەڵك بۆت و هاتنیان بۆ بەردەرگای ماڵەکەت و ڕازی بونیان بە قسەکانت..
گوتی ئەگەر ئەوەی من کردومە تۆش بیکەی وەك منت لێدێت !
گوتی: وەکو چی؟
- گوتی: چاوەکانم لە ئاست حەرامدا دانەواندووە.
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: زمانم گرتووە.
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: خواردنی حەڵاڵم خواردووە.
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: دامێنم پاراستووە .
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: کارەکانم بەباشی ئەنجام داوە .
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: بەڵێنەکانم بەجێهێناوە .
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: ڕێزم لە میوانەکانم گرتووە .
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: دراوسێکەم پاراستووە..
گوتی: پاشان چی؟
-گوتی: وازمهێناوە لەوەی پەیوەندی بە منەوە نییە..

ئەوانە منیان گەیاندە ئەو ئاستەی دەیبینی .
هەر کێشەیەکی بینیبا چارەی دەکرد، دو کەس شەڕیان کردبا ئاشتی دەکردنەوە، جنێوی بەهیچ کەسێك نەدەدا، هیچ بونەوەرێکی ئازار نەدەدا، لە ئەنجامدانی هەر کارێکی مرۆیی یان کۆمەڵایەتی یان خێزانی سڵی نەدەکردەوە..
کاتی نیوەڕۆ (ساران)ی کوڕی هەندێك خواردنی بۆ هێنا، دەستی کرد بە نان خواردن، لە دەرونیدا دەیگوت: ئەگەر مرۆڤ برسی نەبێت تامی تێری ناکات..
ئێستا تۆ برسیتە لوقمان، دوای کەمێکی تر تێر دەبی، پاشان برسیت دەبێتەوە، پاشان تێر..ئەوە ژیانە لەسەر بارودۆخێك ناوەستێت.
خوا منداڵەکانی لێسەندییەوە بەڵام بەم کوڕە ئێسك سوکە قەرەبوی کردیتەوە، کە خەریکە وردە وردە گەورە دەبێت و شوێنی کوڕی یەکەمت بۆ دەگرێتەوە..
کاتێك لە خواردن تەواو بو، سەیری کوڕەکەی کرد، بینی خەمبارە..
دەستی خستە سەر شانی و پێی گوت: کوڕەکەم بەردم هەڵگرتووە بەڵام هیچ شتێکم لە قەرز قورستر نەدیوە، شتی خۆشیشم خواردووە، بەڵام هیچ شتێك وەکو لەش ساغی نییە، تامی تاڵیشم چەشتووە، بەڵام هیچ شتێك وەکو چاوشۆڕی لە بەرامبەر چاکەی خەڵك تاڵ نییە..
کوڕەکەم دایك و باوك دەرگایەکن لە دەرگاکانی بەهەشت، ئەگەر لێت ڕازی بون دەچیتە بەهەشت..
کوڕەکەم، لەگەڵ خراپەکاراندا هاونشینی مەکە، لەوە بترسە کە خوا لە ئاسمانەوە سزایەکیان بۆ بنێرێت و تۆش بگرێتەوە..
کوڕەکەم، لەگەڵ زاناناندا هاونشینی بکە، بەڵکو خوا ڕەحمەتێك بەسەر ئەواندا بنێرێتە خوارەوەو تۆش بگرێتەوە..
کوڕەکەم، دنیات بۆ دوارۆژت بفرۆشە هەردوکیان بەدەست دێنی،

نەکەی دوارۆژت بۆ دنیات بفرۆشی و هەردوکیان لەدەست بدەی..
کوڕەکەم، زوبانت ڕابێنە بە گوتنی: خودایا لێم خۆشبە..چونکە هەندێ کات هەن کە دوعایان تێدا ڕەتناکرێتەوە.
کاتێك بینی کوڕەکەی باش گوێی بۆ شلکردووە، لەقسەکردن بەردەوام بو:
لەگەڵ زانایاندا هاونشین بە، چونکە خوا دڵە مردووەکان بە ڕوناکی زانست زیندودەکاتەوە، هەروەك چۆن زەمین بە باران زیندودەکاتەوە .
کوڕەکەی سەری دەلەقاند، وادیاربو داوای زیاتری دەکرد، بۆیە گوتی:
کوڕەکەم، هاوەڵ بۆ خوا بڕیارمەدە، چونکە هاوەڵدانان ستەمێکی گەورەیە.
کوڕەکەی پرسی: باوکەگیان، ئەگەر تاوانێك بکەم، کەس نەمبینێت، خوا چۆن دەمبینێت؟!
گوتی: کوڕەکەم، ئەگەر تاوانێك ئەوەندەی گەردیلەیەکیش بێت، لەناو بەردێکدا، لە ئاسمان یان لە زەویدا، ئەوا خوا لە دوارۆژدا دەیخاتەڕو، چونکە خوا هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە.
پاشان گوتی: کوڕەکەم، نوێژ بکە، فەرمان بە چاکە بکەو قەدەغەی خراپە بکە..
دوای چەند ساتێك بێدەنگی گوتی: لەسەر کارەساتەکاندا ئارام بگرە، چونکە ئەمە کارێکی گرنگ و گەورەیە.
باوك چەند ساتێکی تر بێدەنگ بو، کوڕەکەی داوای ئامۆژگاری زیاتری دەکرد، ئەویش گوتی:
لەئاست خەڵکی ڕووت وەرمەگێڕە..
کوڕەکەی سەری دەلەقاند و دەگریا !
گوتی: بەناز و فیزەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ..
پاشان گوتی:
بەڕاستی خوا ئەو جۆرە کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆیان بە گەورە دەزانن..

کوڕەکە سەری دەلەقاند
گوتی: لە ڕۆیشتندا میانڕەو بە..
پاشان گوتی: بەدەنگی هێواش بدوێ، چونکە ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژەکانە..
پاشان داوای لە کوڕەکەی کرد کە قاپ و قاچاغەکە بباتەوە ماڵەوەو بزانێ ئاخۆ دایکی کارێکی نییە..
کاتێك کوڕەکەی هەستا خەریك بو ماڵئاوایی لێدەکرد، پێی گوت:
کوڕەکەم دانایی وادەکات هەژاران لەگەڵ پاشاکاندا دابنیشن.
کوڕەکەم گوێڕایەڵی خوا بکە بەبێ کەلوپەل لە بازرگانییەکەتدا قازانج دەکەی.
کوڕەکەم، مەجلیس خۆش بە، چاکەکار بە، زۆر بیربکەوە و کەم قسە بکە، زۆر بگری و کەم گاڵتە بکە..
ئەگەر بێدەنگ بوی بیریکەوە، ئەگەر قسەت کرد بە دانایی قسە بکە.
کوڕەکەم، بە باق و بریقی دنیا مەخەڵەتێ و با گەورەترین خەمت نزیك بونەوە بێت لە خوا.
کوڕەکەم، بۆ سێ شت فێری زانست مەبەو بۆ سێ شت وازی لێمەهێنە:
بۆ ستەم کردن و فیز لێدان و خۆ دەرخستن فێری زانست مەبە..
بۆ زوهد و شەرم کردن لە خەڵك و ڕازی بون بە نەزانیش وازی لێمەهێنە..
کوڕەکەم، لە دوژمنت دووربە، ئاگاداری هاوڕێت بە، خۆت لەکارێك وەرمەدە کە پەیوەندی پێتەوە نییە.
کوڕەکەم، ئەوەی نهێنی خۆی بپارێزێت خاوەنی خۆیەتی..
بۆ هەتیوان وەك باوك بە، لەگەڵ مرۆڤی گەمژەدا دامەنیشە، لەگەڵ مرۆڤی دوڕودا بەهیچ جۆرێکتێکەڵ مەبە..
کوڕەکەم، بزانە کەسی بەخیل سێ سیفەتی هەیە: غەیبەتی هاوڕێکەی دەکاتێك کاتێك لێی دیارنییە، کە لەلای بێت بەچاوێکی سەیر و نامۆ

سەیری دەکات، زمانی بە خراپە نەبێت ناگەڕێت!
لوقمان لەگەڵ کوڕەکەیدا پیاسەی دەکرد و پێی دەگوت:
کوڕەکەم، ئەگەر ویستت هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکدا بکەی، بەر لەوە تووڕەی بکە، ئەگەر دادگەر و هێمن بو هاوڕێیەتی بکە، ئەگەرنا وازی لێبێنە.
کوڕەکەم، لەخوا بترسە و نەکەی ديندار خۆت نیشان بدەی تا ڕێزت بگرن و دەروونیشت پیس و خراپ بێت..
گوێڕایەڵی خوا بکە، چونکە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا بێت لەخراپەی خراپەکاران دەپارێزرێت و خەمەکانی دەڕەوێتەوە..
کوڕەکەم، ئەگەر خوا بەخششێکی پێدای با بە سوپاسگوزاری و چاکەکردن لەگەڵ خەڵکدا شوێنەواری بەسەرتەوە دیاربێت .
کوڕەکەم سوپاسی ئەو کەسە بکە کە چاکەیەکت لەگەڵدا دەکات و چاکەکاربە لەگەڵ ئەو کەسەی سوپاست دەکات، چونکە هەر بەخششێك سوپاسگوزاری لەسەر نەکرێت بەردەوام نابێت.
کوڕەکەم، ئەگەر شەیتان لەڕێگەی گومانەوە هێرشی بۆت هێنا، بە باوەڕ ڕێی پێبگرە،
ئەگەر بە تەمەڵی هێرشی بۆت هێنا، بە بە بیرکردنەوە لە دواڕۆژ بەسەریدا سەرکەوە،
ئەگەر لەڕێی ئارەزووەوە هێرشی بۆت هێنا، بیر لەوە بکەوە کە دنیا هەتایی نییە..
کوڕەکەم، لەگەڵ هاوڕێکانتدا دەم بە خەندەبە، چاکەکاربە، لەکاری چاکەدا دەستیان بگرە، گوێ لە گەورەیان بگرە، و ئاگری خراپە بە ئاوی چاکە دابمرکێنەوە.

* * *

# بەشی شازدەهەم

لە بەرەبەیاندا، هاوسەرەکەی مۆلەتی لێوەرگرت، تا لەگەڵ کوڕەکەیاندا بڕۆن هەندێك گیاوگوڵی زەوی بۆ خواردن بێنن..
مۆڵەتی پێدان، بەو مەرجەی ئاگاداری خۆیان بن.
هاوسەرەکەی گوتی: بە پشتیوانی خوا بۆ نیوەڕۆ دەگەڕێینەوەوخواردنت بۆ دەنێرمە سەر کار..
لوقمان بەرەو کاری خۆی و هاوسەرەکەی بە یاوەری ساران بەرەو گەڕان بەدوای گژوگیادا کەوتنەڕێ..
لوقمان بە دڵێکی خۆش و جەستەیەکی چالاکەوە بەرەو کارەکەی کەوتەڕێ، وەك ئەوەی بەرەو نوێژ بچێت، سڵاوی لە هەردو دراوسێکەی کرد، کە بۆ تێڕوانین بۆ باوەڕ دیدو بۆچونیان زۆر جیاواز بو:
یەکەمیان، تەنیا ئەوەی لەبارەی خواوە دەزانی، کە مرۆڤە چاکەکان دەباتە بەهەشت و یاخییەکانیش بۆ دۆزەخ !
هەمو هەوڵێکی بۆ ئەوەبو کە خوا بیخاتە بەهەشت و لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزێت..
جاری وا هەبو بۆ ئەنجامدانی پەرستشەکان زۆری لەخۆی دەکرد، بۆ نوێژ، بۆ زەکات.. کاتێك بەڕۆژو دەبو هەستی بەبێزاری دەکرد، تێڕوانینی وابو، کە هەردەبێت بەڕۆژو بێت بۆ ئەوەی خوا لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزێت، بە کوێرانەو دڵ داخراوی بە پەرستشەکانی هەڵدەستا، بەڵام لەبەر ئەوەی باوەڕداربو ناچاربو هەردەبو پەرستشەکانی ئەنجام بدات، بۆیە ئارەزوی مردنی دەکرد تا لە پەرستشەکان ڕزگاری ببێت !

خۆی و خێزانی لە قەرەباڵغی بازاڕ و هەر دیمەنێکی سەرنجڕاکێش دەپاراست، نەوەك دەرگای تاوانی بۆ بکەنەوە..ماڵێکی کڕ،مات، بێدەنگ، لە ڕێگادا بە خێرایی و سەر دانەواندن دەڕۆیشت، نەوەکو نەزەرێك بکات و توشی تاوان ببێت، کاتێك بە کەسێك دەگەیشت قسەی لەگەڵ نەدەکرد، نەوەکو وتەیەکی نەشیاوی لە دەم بێتەدەر، تەنانەت لە بیستنیشدا خۆی دەپاراست، نەوەکو بە بیستنی شتێکی خراپ تاوانبارببێت، یاخود بەو بیستنە ببێتە شایەت..

ئەو، ئەو دنیا پان و پۆڕەی لە خۆی و خێزانەکەی تەسك کردۆتەوە بۆ ماڵێکی بچوك!

وا سەیری خوای دەکرد، کە چاوەڕێیە تاوانێك بکات تا فڕێی بداتە دۆزەخ !

لە تەنیشت ئەو پیاوە باوەڕدارە، دراوسێیەکی تر هەیە کە لە دیدی ئەودا باوەڕ دۆخێکی کرۆیە بۆ ناسینی خوا و خەڵك..بۆیە هەوڵی دەدا زیاترین شوێن بگەڕێ و زۆرترین خەڵك بناسێت..

لەدیدی ئەودا هەمو شتێك بۆئەوە دروست بووە تا بەهۆیەوە خوا بناسین، هیچ ڕۆژێك تێنەدەپەڕی کە تێیدا زیاتر خوا نەناسێت..ئەو ناسینە جۆرێك لە ئارامی پێدەبەخشی..

دادگەری خوا ئارامی پێدەبەخشی کە لە دوارۆژدا ستەمی لێناکات..

ئەو لە ئارامییەکی ڕۆحیدا دەژی، بە نوری باوەڕ دڵی ڕوناك بو، ئەگەر بژی ئەوا لەژێر چاودێری و دادگەری خوادایە، ئەگەر بشمرێ ئەوا خاو و خێزانی بەچاودێری خوا جێدێڵێت..

هەرکات توشی تاوانێك ببوایە، دەیزانی کە لێبوردنی خوا فراوانە و چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە..

ئەو خوا دەناسێت و خۆشی دەوێت، بەو خۆشەویستییەشەوە پەرستن دەکات و دڵی ئارام دەکاتەوە..

ئەو بەو جۆرە خوای دەناسی، کە چاوەڕێی کارێکی چاکی لێدەکات تا بەهۆیەوە بیخاتە بەهەشتەوە..
لوقمان بەو سپێدەیە بە وردی سەرنجی ئەوان و سەرنجی ژیانی دەدا.. بە لاشە بەساڵاچووەکەی بەرەو کارەکەی دەڕۆیشت، لەناو بیرکردنەوەیەکی قوڵدابو..
کەواتە، بزانە هاوڕێ، ئەو مرۆڤەی لەسەر زەمینە ناتوانێت هیچ شتێك پێشکەشی ئەو خوایە بکات، کە لە ئاسمانە، چونکە هیچ شك نابات، تەنانەت پەرستنیشی جۆرێکە لە سوپاسگوزاری، بۆ ئەو خودایەی گەنجینەی نیعمەتەکانی پێبەخشیوە..
ئەو سوپاسگوزارییە هیچ سودێك بەخوا ناگەیەنێت، چونکە ئەگەر هەموخەڵکی سەر زەمین بێ فەرمانی بکەن، تەنانەت مرۆڤێکی چاکیش لەسەر زەویدا نەمێنێت هیچ زیان بە خوایەتی ئەو ناگەیەنێت.. لێرەدا مرۆڤ بۆ ئەوە زۆر پەرستش دەکات تا خوا لە تاوانەکانی خۆش بێت و بەرەکەت بخاتە تەندروستی و ماڵ و منداڵی و شوێنەوارێکی باشی لە ژیاندا هەبێت..
هەرچەند مرۆڤ زیاتر باوەڕی بەخوا هەبێت ژیانی هاوسەنگتر دەبێت.. پەیوەندی مرۆڤ بە پەروەردگاری وەکو پەیوەندی نێوان زەوی و ئاسمانە؛ ئاسمان پێویستی بە زەوی نییە بۆ ئەوەی ئاسمان بێت، بەڵام زەوی پێویستی بە ئاسمان هەیە بۆ ئەوەی زەوی بێت..
هاوڕێ، لێرەدا هەستدەکەی کە هێز لەو پەیوەندییە نورانییە وەردەگری، هەستدەکەی کە بەسەر هەست و سۆزی خراپدا زاڵی، چونکە لێوانلێوی لە یادی خوا، پڕی لە ئارامی..
لەو کاتەدا هەمو هەستێکی خوتخوتە خستنە دڵ هەرەس دێنێت، جا خوتخوتەکە لەخۆتەوە بێت، یان لە شەیتانەوە یان لەهەر بونەوەرێکەوە بێت کە بیەوێت زیانت پێبگەیەنێت، چونکە پەیوەندیت بە خواوە بەهێزە..

سنورەکانی خوا چوارچێوەی ژیانی مرۆڤ دیاریدەکەن..
ئەو سنورانە بۆ ئەوە نین کە بە لادان لێیان زیان بە خوا بگات، بەڵکو زیان بە خۆت دەگات..
ئەگەر گۆشتی مرداربو لە رێگادا ببینی و سنوری خواش بۆ گۆشتی مرداربو بزانی، بەڵام لەو سنورە لابدەی و گۆشتەکە بخۆی، ئایا زیان بە خودا دەگات یان بەخۆت؟
دەکرێ ئەوە بکەیە نمونە بۆ هەمو سنورەکانی تری خوا، ئەو سنورانەش لەرێی شەرعی خۆیان لادەچن، بۆ نمونە ئەگەر سنوری خوا لە داوێن پیسیدا ببینی، ئەوا دەبینی لە بەرانبەردا هاوسەرگیری هەیە، کاتێك سنوری خوا لە خواردنی گۆشتی مردارەوەبو ببینی، لە بەرانبەردا خواردنی گۆشتی پاك هەیە، کاتێك سنوری خوا لە دزیکردندا دەبینی، لە بەرانبەردا کارکردن هەیە بۆ دەستکەوتنی پارەی حەڵاڵ...
کاتێك پارێزگاری لەو سنورانە دەکەی بۆت دەردەکەوێت کە خوا هیچ شتێکی لە مرۆڤ قەدەغە نەکردوە تەنیا بۆ بەرژەوەندی ئەو نەبێت..
ژیانی بێ خوا دوورە لە سۆزی ئیلاهی، لە چاودێری..
ئەوکات مرۆڤەکان سەربەست بن، هەرچی دەکەن بیکەن،
لەو جۆرە ژیانەدا چاکە و خراپە یەکسانن، نە پاداشت نە سزا، نە بەهەشت نە دۆزەخ، تەنیا ژیانی دنیا هەیەو پاشان بەرەو لەناوچون..
دەبێ ژیان چۆن بێت؟!
بێگومان یاساکانی دەبنە یاسای دارستان، ئەوکات مرۆڤ دەرك بەوە دەکات کە هەمو یاساو رێسا زەمینییەکان ناتوانن یاخیبونی مرۆڤ بوەستێنن، ژیان ناتوانێت بۆ ماوەی سەدەیەکیش بەردەوام بێت، لەکاتێکدا لەژێر سایەی سنورە خواییەکان، ساڵ دوای ساڵ، سەدە دوای سەدە پەرەدەسێنێت !
ئەوکات مرۆڤ لەپێناو چیدا چاکە بکات، بۆچی خراپە نەکات؟!

بۆچی سەدەقە بکات؟ بۆچی درۆ نەکات؟...

بۆیان دەردەکەوێت کە بونی خوابو ڕێی لەو تاوانانە گرتبو، بۆیان دەردەکەوێت کە بونی خوابو وای لە دەوڵەمەند دەکرد کە بە هەژار ببەخشێت !

مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە ناتوانێت بەبێ خوا لە ژیان بەردەوام بێت..

هەروەها بزانە ئەی لوقمان، کە خوا بەخششت پێدەبەخشێت و تۆش سەربەستی لە خەرج کردنی بەخششەکە، لەوانەیە خوا بە ڕۆژێك یان مانگێك یان ساڵێك خەرجی هەمو ژیانت پێبدات، تۆش لە چۆنیەتی خەرج کردنیدا سەربەستی..

مرۆڤ هەرچەند لە ئایەت و بەڵگەکانی خوا تێبفکرێت، سنگ فراوانتر و بیر تیژتر و ڕێکخراوتر دەبێت، ئەو ڕێکخراوییەی واتا بە ژیانی دەبەخشێت..

ئەوەی یارمەتی مرۆڤ دەدات لەو بێ بەرنامەیی و بێ سەروبەرییەی ژیانی کەم بکاتەوە؛ عەقڵە، کە خوا بە مرۆڤی بەخشیوە و وای لێدەکات کە ژیانی ڕێکخراو بێت و کوێرانە دوای ئارەزووەکانی نەکەوێت..

چونکە خۆشگوزەرانی لەسەر توانای مرۆڤ وەستاوە بۆ کپ کردنەوەی ئەو ئارەزووە کوێرانەیە، چونکە ئەوکاتە هەستدەکەی کە بەسەر ئارەزووە ماددی و مەعنەوییەکانتدا زاڵی و دەتوانی خۆت و خێزانەکەت بەڕێوە ببەی..

ئەوکات هەست بە شانازی دەکەی، پێچەوانەی ئەو کەسەی ئەو هەستەی نییەو ژیانی پڕە لە بێبەرنامەیی و گاڵتەجاڕی..

لێرەدا هەستدەکەی کە مرۆڤ خۆی بڕیار دەدات کە لە ژیانیدا چۆن بێت؛ چاك بێت یان خراپ، ئابڕویەکی باشی هەبێت یان بەد..

لە کارەکانتدا پێویستیت بە ئارامگرتن هەیە لەسەر ناخۆشی و ماندوبون و زیانەکان، تا دەگەیتە ئەو ئامانجەی هەوڵی بۆدەدەی و ئاواتی بۆ دەخوازی..

هەندێ کەس دەبینی کە نیازی ئەنجامدانی کارێکی هەیە خۆی بڕیاریداوە سەرکەوتو نەبێت و بەهانە بێنێتەوە بەوەی کەسێکی بەدبەختەو بۆی نایەتەپێش !

لەبەراتبەریشدا کەسێکی تر دەبینی کە پێداگرە لەسەر کارەکەی، ئەگەر جارێکیش بەخت یاوەری نەبو کۆڵ نادات، تەنانەت ئەگەر درەنگیش بە ئامانجەکەی بگات.

هێشتا ئەو کەسە باشترە لە هاوڕێکەی، کە بێهیوایی هەڵبژارد، ئیتر لە ژیاندا بێ پێگە، بێ ماڵ، بێ هاوڕێ، بێ خێزانێکی بەختەوەر سەرینایەوە، لێرەدا دەتوانی بگەیە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ بریتییە لە کارەکانی..

* * *

# بەشی حەڤدەهەم

لوقمانی دانا..
دۆستی خوا..
ئەو پیاوەی دنیای پڕ کرد لە دانایی.
تەنانەت داوودی پێغەمبەریش شایەتی بۆ داوە!
سەرنجی ژیاننامەی بدەن
ڕەشپێست، بەڵام ڕوو سپی بە نوری دانایی..
سەرنجی خۆبەکەمزانییەکەی بدەن، لە سڵاوکردنی...
ئەو پیاوێکە کە دەکرێ مرۆڤ زۆر شتی لێوە فێر بێت..
لەنێو قەرەباڵغی و ژاوەژاوی شاردا کە تێدەپەڕی هەمویان لەبەری هەڵدەستان و سڵاویان لێدەکرد..
نانی نیوەڕۆی بۆ نەهات، بۆیە بە ساردوسڕی بەرەو ماڵەوە هەنگاوی نا، کە گەڕایەوە..
چووە ژورەوە، بانگی هاوسەرەکەی و کوڕەکەی کرد، وەڵامیان نەبو، لەپڕ چاوی کەوتە سەر دیمەنێکی تۆقێنەر..توشی شۆك بو، کە بینی گورگ هەردوکیانی پارچە پارچە کردووە..
بەسەرسوڕمانەوە سەرنجی دەدا، سەرنجی دڕندایەتی ئەو ئاژەڵانەی دەدا کە چۆن لەژێر سایەی هێزدا ستەم دەکەن..
دووبارە، جارێکی تر تەنیا بووەوە..
دوای نزیکەی شەش مانگ دوبارە ئەوەی بە بیردا هاتەوە کە کۆچ بکات.

خانووەکەی و کەلوپەلەکەی ناوی فرۆشت و قەرزی خاوەن قەرزەکانی گێڕایەوە و بەرەو وڵاتی پاشا و پێغەمبەر داوود کەوتەڕێ..
ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزەی دەنگوباسی بە جیهاندا بڵاو بۆتەوە، بەوەی کە کەسێکە زۆر پەرستش دەکات و دانا و زانا و ئازایە و کەسێکە زۆر هاوسەری هەیە..
چیرۆکی دەرکەوتنی داوود کاتێك دەستی پێکرد کە گەنج بو و لەگەڵ باوکیدا خەریکی لەوەڕاندنی مەڕومالآت بو، لەو کاتەدا جالوت لە بەنی ئیسرائیل قیت بوبووەوەو هەڕەشەی لە هەر کەسێك دەکرد کە بتوانێت ڕوبەڕوی ببێتەوە..
داوود چو بۆ ناو لەشکری تاڵوت، تا هەواڵی سێ براکەی کە لەناو ئەو لەشکرەدابون بۆ باوکی بهێنێت..
داوود هەستی کرد کە لەشکری جالوتی ستەمکار لەشکری تاڵوت لەناو دەبات، کە هەرسێ براکەی ئەویش لەو لەشکرەدان، داوود پرسیاری کرد ئاخۆ تاڵوت چ خەلآتێکی بۆ ئەو کەسە داناوە کە جالوت بکوژێت، گوتیان کە کچەکەی خۆی و پارەو سامانێکی زۆر و پلەو پایەیەکی بەرزی پێدەبەخشێت..
داوود بڕیاریدا خۆی لەو مەترسییە بدات؛ گەنجێکی بچوك بەرانبەر بە ستەمکارێکی گەورە، کە هەمو شەڕکەرێکی بەنی ئیسرائیل لێی دەترسان، بە جۆرێك کە جالوت خۆی شەڕی بە خەڵك دەفرۆشت تا لێی نزیك ببنەوە و شەڕی لەگەڵ بکەن..
لەوکاتەدا داوود چووە بەردەم جالوت، جالوت بە چاوی سوکییەوە سەیری دەکرد، بە گاڵتەجاڕییەوە پێی گوت:
من دەمەوێ شەڕکەری بەتوانا بێنە بەردەمم، نەك گەنجێکی وا کە شەرم دەکەم شەڕی لەگەڵدا بکەم!
لەو کاتەدا داوود بە قۆچەقانی (بەردەقانی)یەکەی بەردێکی بە

ئاراستەی نێوچاوانی جالوت هاویشت، جالوتی پێکا و کەوتە سەر زەوی..دواتر شمشێرەکەی بەرز کردەوەو سەری جالوتی پەڕاند..
هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد؛ ئەو پاڵەوانەی شەڕی لەشکرێکی دەکرد، ئێستا گەنجێك بیکوژێت !
دوای ئەوە لەشکری جالوت ورەیان ڕوخا و ترسیان لێنیشت..
بە پەلە هەواڵ گەیشتە لای تاڵوت، زۆر دڵخۆش بو، ئارەزوی دەکرد ئەو گەنجە پاڵەوانە ببینێت، کە بەو کارە گەورەیە هەستاوە..
ئەو کارە لەسەر تاڵوتی پێویست کرد کە کچەکەی پێشکەش بکات..
تاڵوت بەڵێنەکەی بەجێهێنا و داوود لەگەڵ (میکال)ی کچی تاڵوتدا هاوسەرگیری کرد و پارەو پولێکی باشی پێدا..
داوود، کوڕی یاس کوڕی عوبەید کوڕی عیزز کوڕی سەلەمۆن کوڕی تەحشون کوڕی داب کوڕی حەسرون کوڕی فارس کوڕی یەهودا کوڕی یەعقوب.
لەپڕ داوود بو بە کەسێکی دیار و لە ئازایەتیدا خەڵك نمونەیان بەو دەهێناوە، داوود سەرکەوتن دوای سەرکەوتنی تۆمار دەکرد، تاڵوتیش ڕۆژ دوای ڕۆژ هەستی بە مەترسی ئەو گەنجە دەکرد بەسەر تەختی پاشایەتییەکەیەوە، بۆیە بیرۆکەی لەناوبردنی لەلا گەڵاڵە بو..
داوود هەستی بەوە دەکرد کە پاشا دەیەوێت لەناوی بەرێت و زیاد لە جارێکیش هەوڵی بۆ ئەوە داوە، بەڵام داوود بە سەلامەت دەرچو و تەنانەت دوای ئەوەش ئەو هەر بە دڵسۆزی فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرد..
زۆرجار داوود ئەوەی نیشانی پاشا دەدا کە دەتوانێت لەناوی ببات و تەختی پاشایەتی داگیر بکات، بەڵام ئەو خۆی ئارەزوی ئەوە ناکات..
بەڵام تاڵوت بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی متمانەی پێبکات، سەرەڕای ئەو دڵسۆزییە هێشتا مەترسی لێی هەبو، خۆ ئەگەر داوود ویستبای

زۆر بە ئاسانی دەیتوانی ئەوە بکات، بەڵام ئەو هەرگیز ئەوەی بەبیردا نەدەهات..
دوای ئەوەی داوود لە پاشا بێزار بو و بێ ئومێد بو لەوەی کە متمانەی پێبکات و بەدوای هەلێکدا دەگەڕێت تا لەناوی ببات..بڕیاریدا جێی بهێڵێت و لێی دووربکەوێتەوە..
دوای بڵاوبونەوەی هەواڵی جیابونەوەی تاڵوت لە جالوت، دوژمنان لە هەمو لایەکەوە هێرشیان کردە سەر قەڵەمڕەوی پاشا و خۆی و سێ لە منداڵەکانی لەناو چون.
پێغەمبەر ساموێل چەند جارێك نارەزایی لەسەر هەڵوێستی تاڵوت بەرانبەر داوود دەربڕیبو و پێی باش بو کە دوای پاشایەتی تاڵوت داوود ببێتە پاشا.
داوودیان گێڕایەوە و بە پێشنیاری پاشایەتی ڕازیبو و چووە سەر چیای حەبرون، سەرانی هۆزی یەهودا ئامادەبون، بەڵام هەندێك لە سەرانی بەنی ئیسرائیل نەیار بون و بە سەرکردایەتی (ئیشپۆشت)ی کوڕی تاڵوت لەشکرێکیان پێکهێنا و ڕوبەڕوی داوود بونەوە..
شەڕێکی سەخت لەنێوان هەردو لادا ڕویداو لەشکری ئیشپۆشت شکاو ئیشپۆشت کوژرا، بەمەش داوود بووە سەرکردەی هەمو لەشکری بەنی ئیسرائیل..
دوای ئەوە خوا سروشی بۆ نارد و کردی بە پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل..
ئەی لوقمان سەرنجی ئەو جەنگانە بدە کە مرۆڤ لە دژی مرۆڤدا لەپێناو دەسەڵاتدا ئەنجامیان دەدات!
مرۆڤ ناتوانێت هیچ کارێکی باش بکات ئەگەر خۆشەویستی ڕێگای بۆ ڕوناك نەکاتەوە.
مرۆڤ بەبێ خۆشەویستی هێزی نامێنێ، بێ هیوا دەبێت !
مرۆڤ بە ئەندازەی تێکەڵ بونی لە گەڵ گەلانی دەوروبەر و ئایینە

جیاجیاکانی تر دەتوانێ باشتر پەرستشەکانی جێبەجێ بکات، هەر کاتێکیش خۆی یان خێزانی لەو برایانەی بە دوور گرت ئەوا بەو ئەندازەیە لە بەجێهێنانی پەرستشەکانیدا کەمتەرخەمە..هەر کاتێکیش لەگەڵ ئەو برایانەیدا کۆك نەبو؛ بە خۆشییان دڵخۆش نەبو و بە ناخۆشییان خەمبار نەبو، یان بە ناخۆشییان دڵخۆش بو و بە خۆشییان خەمباربو، یان پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاندن؛ نە سڵاوێك، نە گفتوگۆیەك، نە هاوکارییەك، نە سەردانێك، نە کڕین و فرۆشتنێکی لەگەڵدا کردن، ئەوا دروشمەکانی ئایینەکەی جێبەجێ نەکردووە..

ئایین بۆ ئەوە هاتووە دەرگاکانی خۆشەویستی نێوان مرۆڤ و برای مرۆڤی واڵا بکات و هەرچی دەرگای ڕق و کینەیە دایبخات و بەخەڵك بڵێت کە زەمین موڵکی هەمو مرۆڤایەتییە، بە خەڵك بڵێت کە تەنیا پەرستش نییە مرۆڤ لەلای خوا خۆشەویست دەکات، بەڵکو خۆشەویستی و لێبوردەیی و بەخشینە، کە مرۆڤ لەلای خوا خۆشەویست دەکات.

کۆمەڵگای گەورەی مرۆڤایەتی کە مرۆڤ تێیدا دەژی، هیچ بایەخی کەمتر نییە لە کۆمەڵگا بچوکەکەی و ماڵە تایبەتییەکەی !

بە تێپەڕبونی کات پاشاکان پاشایەتی خۆیان دەکەن و دەڕۆن؛ یان بە سەر بەرزی دەڕۆن یان بە سەرشۆڕی، ئەوە تەنیا مرۆڤە کە پاشای زەمینە و دەمێنێتەوە..

مرۆڤ بە تەنیا هیچی پێناکرێت، هەر دەبێ لەگەڵ برای مرۆڤی خۆیدا دەست لەناو دەست بێت، بە تێپەڕبونی کات بۆی دەردەکەوێت، کە لادێیەك نابێتە شار، زمانێك زانا دروست ناکات، تاقە گەڵێك ژیارستانییەت بنیات نانێت، بیروباوەڕێك بەتەنیا بەس نییە.

لوقمانی دانا دەزانێت کە خوا زۆر بەخششی بەسەر داووددا ڕشتووە.. دانایی، دادوەری، ڕەوانبێژی، چیا و باڵندەکانی بۆ ڕام کردووە.

هەروەها خوا دەنگێکی زۆر خۆشی پێبەخشیوە و تەسبیحاتی خوای پێدەکات.
لوقمان زۆر ئارەزوی ئەوە دەکات کە گوێی لە دەنگە خۆشەکەی بێت کاتێك زەبور دەخوێنێتەوە.
دەیەوێ ئەو پیاوە ببینێت کە خوا ئاسنی بۆ نەرم کردووە..
سەرەڕای ئەوەی ئەزمونی چەند ژنی بۆ فەراهەم کردووە.
هەندێ لە نەیارانی درۆ و دەلەسەی سەیر و سەمەرەیان لەبارەی بڵاو دەکردەوە..
یەکێك لە سەیر و سەمەرەترین ئەو درۆ و دەلەسانەش، کە هیچ عەقڵێك باوەڕی ناکات و هیچ کەسێکی باوەڕدار بە داوودی ڕەوا نابینێت، ئەوەی کە شەیتان خۆی خستبێتە سەر شێوەی کۆترێکی زێڕین و لەکاتێکدا کە داوود خەریکی نوێژ بووە لەنێوان هەردو قاچیدا نیشتووە و داوود دەستی درێژ کردووە تابیگرێت و چەماوەتەوە، کۆترەکەش هەر دوورکەوتۆتەوەو داوودیش دوای کەوتووە تا چۆتە ناو درزی دیوارێك، داوودیش چووە تا بیگرێت بەڵام فڕیوە و داوودیش سەیری کردووە تا بزانێت بۆ کوێ دەفڕێت لەپڕ چاوی کەوتۆتە سەرئافرەتێك کە خەریکی خۆشۆردن بووە، ئافرەتێکی بێ وێنە لەجوانیدا، کاتێك ئافرەتەکە ئاوڕی داوەتەوە داوودی بینیوە، یەکسەر بە قژی خۆی داپۆشیوە، بەمەش زیاتر سەرنجی داوودی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە !
دەگوترێ کە داوود چۆتەلای و پرسیاری دەربارەی مێردی لێکردووە ئەویش گوتویەتی کە سەربازە و لە فڵان لەشکر لە جەنگدایە..
دەگوترێ، کە داوود پەیامی بۆ سەرلەشکرەکە ناردووە کە کابرا بنێرنە بەرەی فڵان جەنگ، پاشان کوژراوەو دواتر داوود ژنەکەی مارەکردووە!
هەروەها دەگوترێ، کە داوود جارێکیان ئافرەتێکی دیوە کە لە ئاوێکدا خەریکی خۆشۆردن بووە، ئافرەتەکە کە سێبەری داوودی دیوە یەکسەر

خۆی داپۆشیوە، مێردی ئافرەتەکەش لە جەنگدا بووە، دەڵێن کە داوود کارێکی کردووە کە بنێردرێتە پێشەوەی بەرەی جەنگ و کوژراوە، پاشان داوود مارەی کردۆتەوە !

قسەگەلێکی زۆر خراپتر دەربارەی بێڕێزیکردنی گەلان بە پێغەمبەرەکانیان دەگوترێت، لەوانە:

دەڵێن کە شەوێکیان داوود لە ئۆرشەلیم چۆتە سەربانی کۆشکی پاشا، لەوکاتەدا چاوی کەوتۆتە سەر ئافرەتێك کە لەسەر بانی ماڵەکەیدا خەریکی خۆشۆردن بووە، ئافرەتەکە زۆر شۆخ و شەنگ بووە، داوود پرسیاری دەربارەی کردووە، گوتویانە ئەوە ئافرەتی (بتشبەع)ی کوڕی (ئەلیعام)ە هاوسەری (ئۆریا)ی (حیسسی)..

دەگوترێ داوود هەواڵی بۆناردووەو لەگەڵیدا جووت بووە، دواتر دوگیان بووە و هەواڵی داوەتە داوود کە دوگیانە..دوای ئەوە داوود نامەیەکی بۆ سەرلەشکری ئۆریا نوسیوە کە ئۆریا بنێرێتە بەرەی سەختترین جەنگ..

ئۆریا بریندار دەبێت و دوای هەشت ڕۆژ برینداری دەمرێت، دوای ئەوەش داوود ژنەکەی مارە دەکاتەوە !

هەروەها دەگوترێ کە لە بەنی ئیسرائیلدا ئافرەت بۆی نەبووە دوای مێردی یەکەمی مێرد بکاتەوە، بەڵام داوود یەکەمین کەس بووە کە ئەو نەریتەی شکاندووە!

بەڵێ ئەو قسە خراپانە دەربارەی ئەو پیاوە بەڕێزە گوتراوە کە هەردو کاری پێکەوە کردووە، پێشتر کاری پێغەمبەران تەنیا بانگەواز بووە، بەڵام داوود هەردو کاری پێغەمبەرایەتی و تێکۆشان لە پێناو خوای پێکەوە کردووە..

سەرکەوتنی بەسەر حونەفاکان بەدەستهێنا، لەگەڵ موئابدا جەنگا و تێکی شکاندن، لەگەڵ ئەددازاری پاشای سۆبا شەڕی کرد و تێکی شکاند...

ئێستا خەریکە دەبێتە گەورەی سەردەمی خۆی؛ هەزاران سەرباز بەشەو و بەڕۆژ لە ئامادەباشیدان، خواش کتێبی ئاسمانی بۆ نارد، ئەمە سەرەڕای کاری دادوەری..

ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژو دەبو، شەوانە بۆ شەونوێژکردن هەڵدەستایەوە..

بەڵێ ئەوە داوودە ئەی لوقمان، ئەو پیاوەی بۆ دنیا و دوارۆژ دەژی و لەگەڵ هەمو بارودۆخێکدا خۆی دەگونجێنێت..

لوقمان هەمو هەواڵێکی ئەو پیاوەی دەبیست و وانەی لێوە فێر دەبو..

ئەو ئەو پیاوەیە کە لوقمان بەڕێزەوە باسی دەکرد و هەوڵیدەدا هەواڵی بزانێت.

دووەمین کەسە کە پاشاو پێغەمبەرایەتی پێبەخشرابێت، دوای پاشاو پێغەمبەر زولقەرنەین(عەییاش)، سەرەڕای ئەو ڕێژە زۆرەی پێغەمبەران ئەوانەی تەنیا وەکو پێغەمبەر مانەوەو نەبون بە پاشا، یان خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان.

داوود وەك لۆکە مامەڵەی لەگەڵ ئاسندا دەکرد، لەو ئاسنە قەڵغان و چەك و تفاقی جەنگی دروستدەکرد.

هەروەها خوا کاری دادوەری لەنێوان خەڵکدا پێبەخشیبو، دەگێڕنەوە کە جارێکیان کاتێك داوود خەریکی پەرستش بووە، دو پیاو چونەتە ژورەوە، لەکاتێکدا بە پاسەوانەکانی ڕاگەیاندبو کە مۆڵەت بەهیچ کەس نەدەن بێتە ژورەوە کاتێك کە خەریکی پەرستشە..

بە داوودیان گوت: مەترسە، ئێمە دو کەسین ناکۆکی کەوتۆتە نێوانمان، داوەریمان لەنێواندا بکە..

داوود گوتی: کێشەتان چییە؟

پیاوی یەکەم گوتی: ئەو برایەم نەوەدونۆ مەڕی هەیە، منیش تەنیا یەك مەڕم هەیە، کەچی دەڵێت ئەو مەڕەشم بدەرێ، دەیەوێ بە قسەی زل و فرو فێڵ لێم بسەنێت..

داوود بەبێ ئەوەی گوێ لە کەسی دووەم بگرێت و قسەکانی ببیستێت، گوتی:
ئەو برایەت ستەمی لێکردوی، بەوەی داوای مەڕەکەی تۆی کردووە، زۆربەی هاوبەشەکان ستەم لە یەکتر دەکەن، تەنیا ئەوانە نەبن کە باوەڕێکی پتەویان هەیە..
دوای ئەوەی ڕۆیشتن داوود هەستی کرد کە لە بڕیارداندا پەلەی کردووە، چونکە گوێی لە لایەنی بەرامبەر نەگرتووە، بۆیە کڕنوشی بۆ خودا برد و داوای لێخۆشبونی کرد..دوای ئەوە بڕیاریدا لەمەودوا گوێ لە لایەنی بەرامبەر بگرێت ئینجا بڕیار بدات..
لوقمان گوێی لەو ڕوداوانە دەبو و زانیاری و ئەزمونی زیادی دەکرد.. هەروەها دەگێڕنەوە کە دو ژن هاتنە لای داوود، گورگ منداڵی یەکێکیانی بردبو.
یەکێکیان بەوی دی دەگوت:
گورگ منداڵەکەی تۆی بردووە،.
ئەوی دیش دەیگوت: نا، هی تۆی بردووە.
چونەلای داوود، ئەویش منداڵەکەی دا بە گەورەترینیان، دوتر چونە لای سولەیمانی کوڕی، کە ئەوکات تەمەنی یازدە ساڵان بو، ئەویش گوتی:
چەقۆیەکم بۆبێنن با بەشی بکەم لە نێوانتاندا..
بچوکەکەیان گوتی:
نا..توخوا..کوڕی ئەوە، بیدە بە ئەو..
ئەوکات سولەیمان زانی کە منداڵی ئەوەو سۆزی بۆی هەیە، بۆیە بە بچوکەکەی بەخشی.
داوود؛ پاشای دینداری دەوڵەمەندی دادوەر..
زەبوری بە حەفتا شێواز دەخوێندەوە، شەوانە نوێژی دەکرد و دەگریا، بە

دەنگە خۆشەکەی مرۆڤی خەمبار و نەخۆش چاك دەبووەوە.
دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان داوود چۆتە دەرەوە لە چۆڵەوانیدا زەبوری بە ئاواز چڕیوە، هەرچی چیاو بەرد و باڵندە و درەخت و دڕندە هەیە لەگەڵیدا دوبارەیان کردۆتەوە..
هەر لە ڕۆشتن بەردەوام بووە تا گەیشتۆتە چیایەك کە پێغەمبەر (حەزقیل)ی لەسەر بووە، کاتێك دەنگی چیا و دڕندە و باڵندەکانی گوێ لێبو، زانی کە داوودە..
داوود گوتی: حەزقیل، ڕێگام پێدەدەی بێمەلات؟
گوتی: نەخێر !
داوود گریا، لەوکاتەدا خوا سروشی بۆ حەزقیل نارد:
ئەی حەزقیل، داوود مەشکێنەوە، لێی گەڕێ با بێتە لات..
دوای ئەوە حەزقیل چو خۆی دەستی داوودی گرت و بردیە لای خۆی..
داوود لێی پرسی:
ئەی حەزقیل هیچ کاتێك ئەوەت بە خەیاڵدا هاتووە تاوانێك بکەی؟
گوتی: نەخێر.
پاشان گوتی: ئایا هیچ کاتێك بەخۆت سەرسام بوی لە پەرستنی خوادا؟
گوتی: نەخێر.
گوتی: ئایا هیچ کات مەیلت بەلای دنیادا چووە کە پێیەوە سەرقاڵ بی؟
گوتی: بەڵێ، لەوانەیە زۆر جار ئەوە ڕویدا بێت !
گوتی: ئەگەر ئەوە ڕوبدات چی بکەی باشە؟
گوتی: برۆ ئەو ژوورە، بەڵام پەند وەربگرە !
داوود چووە ژورەوە، بینی قەرەوێڵەیەکی ئاسن، کەللە سەرێك و ئێسك و پروسکی شیبووەوەی لەسەر بو، تابلۆیەکیشی لەسەر بو، لەسەری نوسرابو:
من(ئەروی سەلەم) هەزار ساڵ پاشایەتیم کرد، هەزار شارم بنیات نا،

هەزار ژنم هێنا، بەڵام لە کۆتاییدا خاك بووە فەرشم، بەرد بووە سەرینم، کرم و مار و دوپشك بونە دراوسێم، هەر کەسێك ئەو ئێسك و پروسکەی منی دی، با پەند وەربگرێت و بە دنیا نەخەڵەتێت..

هەروەها دەگێڕدرێتەوە کە خوا سروشی بۆ داوود ناردووە، پێی فەرمووە:
بۆچی دەبینم تەنیا دەژی؟!

گوتی: من خەڵکم جێهێشت و ئەوانیش وازیان لێهێنام.

فەرموی: ئەدی بۆچی بێدەنگی؟

گوتی: لە ترسی تۆ !

فەرموی: بۆچی سەرەڕای ئەوەی من زۆرم پێبەخشی، بەڵام هەژاری؟

گوتی: جێبەجێکردنی مافی تۆ هەژاری کردم !

فەرموی: بۆچ دەبینم بێدەسەڵاتی؟

گوتی: گەورەیی تۆ وای لێکردوم..

خوا فەرموی: مژدەت لێبێت گەورەییت پێدەبەخشم، لە ڕۆژی دواییشدا هەرچیت بوێت پێتدەبەخشم..

ئەی داوود، لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ ببەو خۆت لەوان جیا مەکەوە، چونکە خۆ بەکەمزانان لە ڕۆژی دواییدا لە هەمو کەس لەمن نزیکترن و خۆبەزلزانان لە هەمو کەس لەمن دوورترن.

ئەی داوود، بەندەی من چاکەیەك دەکات و منیش لە بەرانبەر ئەو چاکەیەیدا بەهەشتی پێدەبەخشم..

داوود پرسی: ئەو چاکەیە چییە خودایا؟

فەرموی: خۆشی بخاتە دڵی بەندەیەکمەوە.

داوود گوتی: ئەوە لەسەر هەموکەسێك پێویستە کە بە تەواوی تۆ بناسێت..

ئەی داوود گوێبگرە: هەر کەسێك منی خۆشبوێ و بۆلای من بگەڕێتەوە دەیبەمە بەهەشت..

ئەی داوود، کارێك هەیە هەر کەسێك ئەنجامی بدات دەیبەمە بەهەشت!

داوود پرسی: ئەو کارە چییە پەروەردگارا؟!
فەرموی: هەر کەسێك ناخۆشییەك لەسەر بەندەیەك لاببات..
داوود گوتی: خودایا، لەبەر ئەو میهرەبانییەت نابێت هیچ کەس لەتۆ بێ هیوا بێت..
ئەی داوود: لە خۆشیدا منت لەبیر بێت، لە ناخۆشیدا بە هاناتەوە دێم.
ئەی داوود، مژدە بە تاوانباران بدە و بەخشەرانی پارە و سامان ئاگادار بکەوە!
گوتی: چۆن مژدە بە تاوانباران بدەم و بەخشەران ئاگادار بکەمەوە؟
فەرموی: بە تاوانباران بڵێ، کە من تەوبە قەبوڵ دەکەم و لە تاوانەکان خۆش دەبم..
بە بەخشەرانیش بڵێ با بە بەخشندەییان سەرسام نەبن.
ئەی داوود سوپاسگوزاریم بکە..
گوتی: خودایا، چۆن دەتوانم سوپاسگوزاریت بکەم، لەکاتێکدا سوپاسگوزاریشت هەر نیعمەتە؟!
فەرموی: ئێستا سوپاسگوزاریت کردم.
لوقمان لەم زەمین بۆ ئەو زەمین هەواڵ و وانەی نوێی لە داوود گوێ لێدەبون، بەڵام ئەم جارە خۆی پرسیاری لە خەڵك دەکرد، دوایین هەواڵ ئەوەبو، کە ئافرەتێك چۆتە لای داوود و پێی گوتووە:
ئەی داوود، پەروەردگارت ستەمکارە یان دادگەر؟
داوود وەڵامی داوەتەوە: خودا ئەو دادگەرەیە، کە هەرگیز ستەم ناکات، پاشان لێی پرسیوە: چیرۆکی تۆ چییە؟
گوتویەتی: من بێوەژنم، سێ کچم هەیەو بە تەشی ڕێسی خەرجییان دەکەم، دوێنێ ئێوارە شتێکی جوانم چنیبو، زۆر خۆم پێیەوە ماندو کردبو، چوم بیفرۆشم تا خەرجی منداڵەکانمی پێبکەم، کەچی لەناکاو، باڵندەیەك هات و لێی ڕفاندم، بۆیە بە خەمباری سەرم نایەوە..لەو

کاتەدا کە لەگەڵ داووددا خەریکی گفتوگۆ بو، لە دەرگا درا..
کاتێك داوود فەرمانی هاتنەژورەوەی دا، بینی ١٠ بازرگان هاتون، هەر یەکەیان ١٠٠دیناری لە دەستدایە..
پێیان گوت، ئەی پێغەمبەری خوا، بیدە بە ١٠ کەسی پێویست.
داوود پێی گوتن: هۆکاری ئەو ماڵ بەخشینەتان چییە؟
گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەنێو کەشتییەکدا بوین، بایەکی توند هەڵیکرد، خەریك بو نقوم ببین، لەپڕ پەڕۆیەك لە باڵندەیەك کەوتە خوارەوە، ئێمەش بەم پارچە چنراوە کونی کەشتییەکەمان گرت و ڕزگارمان بو، ئیتر نەزرمان کرد کە هەر یەکەو ١٠٠دینار ببەخشین، ئەوەتا ئێستاش لەبەردەستی جەنابتان دایەو بە ئارەزوی خۆتان بیبەخشن..
داوود ڕوی کردە ژنەکەو پێی گوت: پەروەردگارم لە دەریاو وشکانیدا بازرگانیت بۆ دەکات، هێشتاش دەڵێی ستەمکارە؟!
پاشان هەزار دینارەکەی پێدا و گوتی، خەرجی منداڵەکانتی پێبکە.
کاتێك لوقمان گەیشتە ناوچەکە، خەڵك پێیان زانی و بە پەلە هاتنە پێشوازی..
ئەوە ئەو پیاوەیە، کە ناوبانگی لە پێغەمبەرەکەیان کەمتر نییە..
پیاوێکی پیر لەناو کۆمەڵە کەسێکدا باسی لوقمانی دەکرد، هەندێك لە وتە بەنرخەکانی بۆ باس دەکردن، دەیگوت:
شێر گوتی: جارێکیان دو گام بۆ هاتن، زۆر بەهێز بون، بە شاخەکانیان چاکیان تێهەڵدام، تا ئەوکاتەی بە تەنها کەوتمە بەرامبەر یەکێکیان، پێم گوت:
ئەگەر واز لە هاوڕێکەت بێنی ئازارت نادەم، کاتێك وازی لە هاوڕێکەی هێنا هەردوکیانم ڕاو کرد !
جارێکیان کەرەکێوییەك تینو بو، هاتە سەر کانییەك ئاو بخواتەوە، بەڵام

سەیری خۆی دەکرد و خەیاڵی ڕۆیشت، لەو کاتەدا چەند ڕاوچییەك هاتن ڕاوی بکەن، کاتێك لە دەشتایی بون نەیانتوانی ڕاوی بکەن، بەڵام کە گەیشتنە ناو چیا و دارودرەخت، لەوێدا پێی گەیشتن و ڕاویان کرد..

بەر لە مردنی گوتی: بەڕاستی هەژارم، ئەوەی وامدەزانی دوژمنمە پاراستمی، کەچی ئەوەش کە وامدەزانی پشت و پەنامە فەوتاندمی!

جارێکیان مرۆڤێك پشتە دارێکی قورسی لەپشت بو، کاتێك بێزاربو، دوعای مردنی لەخۆی کرد، یەکسەر مردن هاتە بەردەمی و پێی گوت: فەرمو، بۆچی بانگت کردم؟!

گوتی: بۆ ئەوە بانگم کردی تا ئەو بارە قورسەم بۆ هەڵبگری!

جارێکیان مرۆڤێك لەماڵەکەیدا بتێکی هەبو دەیپەرست، هەمو ڕۆژێك ئاژەڵێکی بۆ سەردەبڕی، تا ئەو کاتەی هیچی نەما پێشکەشی بکات، لەو کاتەدا بتەکە هاتە دەنگ:

هەمو شتێکت لەپێناو مندا بەفیڕۆ مەدە، جا لە دواڕۆژیشدا لۆمەی من بکەی!!

جارێکیان پیاوێك، مەڕێك و بزنێك و بەرازێکی بۆ فرۆشتن بردن بۆ بازاڕ، مەڕ و بزنەکە زۆر هێمن بون، بەرازەکەش ئۆقرەی نەبو، پیاوەکە بە بەرازەکەی گوت: بۆ ئۆقرەت نییە؟!

بەرازەکە گوتی: گەورەم هەر کەسە و دەردی خۆی باشتر دەزانێت! من دەزانم مەڕەکە لەبەر خاتری خورییەکەی بەخێو دەکەن، بزنەکەش بۆ شیرەکەی، منی بەدبەختیش کە نەخوریم هەیە نە شیر، بە دڵنیاییەوە لەگەڵ گەیشتنمدا دەمنێرنە قەسابخانە!

کیسەڵێك و کەروێشکێك پێشبڕکێیان کرد، لەسەر ئەوەی کامیان زوتر دەگەنە لوتکەی چیا..

کەروێشکەکە بە پشت بەستن بە خێرایی خۆی و هێواشی کیسەڵەکە خەوت!

بەڵام کیسەڵەکە لە ڕۆیشتن بەردەوام بو، کاتێك گەیشتە لوتکەی چیاکە، ئینجا کەروێشکەکە خەبەری بووەوە!

ئاسنگەرێك سەگێکی هەبو، کاتێك ئاسنگەرەکە خەریکی کارکردن بو دەخەوت، کاتێکیش دەستی لەکار هەڵدەگرت تا لەگەڵ هاوڕێکانیدا نان بخوات، لەە خەو هەڵدەستا، ئاسنگەرەکە گوتی:

بەڕاستی سەیرە، بە دەنگی ئەو ئامێرانە خەبەرت نابێتەوە، کەچی بە دەنگی نان خواردنی ئێمە خەبەرت دەبێتەوە!

جارێکیان گەرما و با کەوتنە دەمەتەقێ لەسەر ئەوەی کە کامیان دەتوانێت وا لە مرۆڤ بکات جلەکانی دابکەنێت!

سەرەتا با بەتوندی هەڵیکرد، کەچی لەجیاتی داکەندن، مرۆڤەکە بە توندی جلەکانی لەخۆیەوە پێچان..بەڵام کاتێك خۆر هەڵات و دنیا گەرم داهات، مرۆڤەکە لەگەرما خۆی نەگرت و جلەکانی داکەندن!

لەکاتێکدا کە ئەو پیرەپیاوە ئەو پەندانەی لوقمانی حەکیمی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، هەواڵیان پێگەیشت کە لوقمان ئێستا لە یەکێك لە ماڵەکانی ئەو ناوچەیەیە!

هەموویان بە جۆش و خرۆشەوە بەرەو پیری دیداری لوقمان چون، بینیان لەنێو کۆڕێکدا دانیشتووە، خەڵك پرسیاری لێدەکەن و ئەویش وەڵامیان دەداتەوە..

یەکێك لە ئامادەبووان گوتی: ئەی دۆستی خوا، ئامۆژگاری چیم دەکەی، کە من گەنجێکم تازە دێمە نێو کایەکانی ژیانەوە؟

گوتی:

ئەگەر لە نوێژدابوی، دڵت بپارێزە

ئەگەر لەسەر خوان بوی، گەدەت بپارێزە

ئەگەر لە ماڵی کەسێك بوی، چاوت بپارێزە

ئەگەر لەنێو خەڵکدا بوی، زمانت بپارێزە.

گەنجەکە گوتی: چ سیفەتێك زۆر خراپە؟
گوتی: کوفر.
گوتی: ئەگەر دو بن؟
گوتی: کوفر و خۆبەزلزانی.
گوتی: ئەگەر سێ بن؟
گوتی: کوفر و خۆبەزلزانی و سپڵەیی.
گەنجەکە گوتی: ئەگەر چوار بن؟
گوتی: کوفر و خۆبەزلزانی و سپڵەیی و بەخیلی.
گوتی: ئەگەر پێنج بن؟
گوتی: کوفر و خۆبەزلزانی و سپڵەیی و بەخیلی و بێ ڕەوشتی.
گوتی: ئەگەر شەش بن؟
گوتی: کوڕەکەم، هەر کەسێك ئەو کۆمەڵە خاسیەتەی هەبن، بەدبەختەو لەخوا دووره.
کەسێکی تر گوتی: ئەی دانا لە چ شتێك پەشیمانی و لەچی پەشیمان نیت؟
گوتی: لە قسەکردن پەشیمانم و لە بێدەنگی پەشیمان نیم.
کەسێکی تر گوتی: ئەی دانا، شتێکم پێبڵێ سودم پێبگەیەنێت.
گوتی: هەر کەسێك لە دەرونیدا ئامۆژگاریکار و ئاگادارکەرەوەی هەبێت خواش دەیپارێزێت.
گوتی: پاشان
گوتی: ئەگەر لە کانییەك ئاوت خواردەوە بەردی تێماوێ.
گوتی: پاشان چی؟
گوتی: بولوبولێکی خۆت لە مانگای کەسێکی تر باشترە..
پیاوێك گوتی: ئەی لوقمان هەمو شتێکت بە خەڵك گوتووە؟
لوقمان سەیری کرد و گوتی: هێشتا قسەیەکم ماوە کە پێتانم نەگوتووەو

دەترسم بمرم و نەتوانم پێتان بڵێم:
من لە ناییندەی ئێوە ترسم هەیە مرۆڤەکان!
پیاوەکە گوتی: لەچی لێمان دەترسی ئەی نوری دڵ؟
گوتی: لە مەترسی خۆتان لەسەر خۆتان.
پاشان گوتی: ئەو زیانەی مرۆڤ بە مرۆڤی دەگەیەنێت، زۆر لەوە خراپترە کە بومەلەرزەو دڕندەکان پێی دەگەیەنن.
پێویستە لە دڕندەیی ئاژەڵان زیاتر لە دڕندەیی خۆتان بترسن..
پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئەوەی لەیاد بێت کە مرۆڤە و مرۆڤەکانی تر هەمو برای ئەون، بە چاوپۆشین لە ڕەگەز و ڕەنگ و ئایین، پێویستە تەنانەت لە گۆڕەپانی جەنگیشدا ئەوەی لەیاد نەچێت، پێویستە ئەوەی لەیاد بێت کە ئەو مرۆڤەی دەیکوژێت، دایکی، خوشکی، هاوسەری، منداڵەکانی بۆی دەگرین و ئەو کەسەی شمشێری بەڕودا بەرز دەکاتەوە، کوڕە،برایە، مێردە، باوکە..
هەروەها ئەوەش بزانن، وەك چۆن لەنێوان گورگ و مەڕدا دۆستایەتی نییە، ئاواش لە نێوان مرۆڤی خراپ و مرۆڤی باشدا دۆستایەتی نییە.
لە مرۆڤە خراپەکان دووركەونەوە، دەرونتان چاك دەبێت، جەستەتان ئارام دەگرێت، ئەوەش بزانن کە دۆستایەتی مرۆڤی چاك دڵ ئاوەدان دەکاتەوە..
زۆر یادی خوا بکەن، چونکە خوا یادی ئەو کەسانە دەکات کە یادی دەکەن.
بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر لوقمان بەرەو بەیتولمەقدیس بەڕێکەوت بۆ دیداری (داوود)، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە قەڵەمڕەوەکەی ببینێت، سەیری ئەو بورجە گەورەیەی دەکرد، کە داوود بۆ چەك دروستی کردبو، ئەو ئێستا بەهێزترین مرۆڤی ئەم سەردەمەیە، دەسەڵاتەکەشی لەڕێی سولەیمانی کوڕییەوە درێژەی پێدەدرێت، چونکە خوا پێی ڕاگەیاندبو: (ئەی داوود پێویستە جێنشینێکت هەبێت، چونکە نابێ هیچ گەلێك بێ پێشەوا بێت).

دەگوترێت، کە داوود ئەوەی بە هاوسەرەکانی ڕاگەیاندووە، یەکێك لە هاوسەرەکانیش پێشنیاری ئەوەی کردووە، کە کوڕی گەورەیان بکرێتە جێنشین.

کاتێك داوود خەریك بو ئەو هەواڵە بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، سروشی بۆ هات:

(ئەی داوود لە دیاریکردنی جێنشیندا پەلە مەکە، تاکو من ئاگادارت دەکەم).

پرسەکە هەر بەم شێوەیە بە هەڵواسراوی مایەوە، تا ڕۆژێکیان دو کەس کە دەمەقاڵێیان بو هاتن بۆلای داوود تا دادوەرییان لە نێواندا بکات، یەکێکیان خاوەنی باخچە بو ئەوی دی خاوەنی مەڕوماڵات بو..

خاوەنی باخچەکە بە داوودی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا مەڕوماڵاتی ئەو کابرایە چونەتە ناو باخچەکەمەوەو هەمو کشتوکاڵەکەیان خواردووەو تێکیان داوە، حوکمی تۆ چییە؟

داوود ئەمجارەیان بە پەلە بڕیار نەدا، داوای کرد کە کەمێك مۆڵەتی پێ بدەن تا حوکمێکی دادگەرانەیان بۆ بدات، لەو کاتەدا سروشی بۆ هاتە خوارەوە:

(ئەی داوود، کوڕەکانت بانگ بکە، چیرۆکەکەیان بۆ بگێڕەوە، کامیان حوکمێکی دادگەرانەی دا، بیکە بە جێنشینی خۆت).

داوود کوڕەکانی بانگ کرد و چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوەو داوای حوکمی لێکردن..

دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ هیچ کام لە کوڕەکانی نەیانتوانی حوکمێك دەربکەن، دوای ئەوە داوود بە سولەیمانی گوت، کە بچوکترین کوڕەکانی بو و دوایین کەس بو کە گومانی ئەوەی هەبێت ببێتە جێنشینی..

سولەیمان بەباشی دانیشت و پرسیاری لە خاوەن باخچەکە کرد:

چ کاتێك مەڕوماڵاتی ئەو کابرایە هاتۆتە نێو باخچەکەت؟

پیاوەکە گوتی: گەورەم لەکاتی شەودا هاتوونەتە ناو باخچەکەمەوەو هەرچی بەروبوم هەیە خواردویانە.
سولەیمان ڕوی کردە خاوەن مەڕومالاتەکەو پێی گوت: تۆ تاوانباری، پیاوی چاك مەڕومالات لە ڕۆژدا دەلەوەڕێنرێت،لە ڕۆژدا خەڵك ئاگای لە باخ و باخاتی خۆیەتی، بەلام لە شەودا خەڵك نوستووەو پێویستە خاوەن مەڕومالاتەکان ئاگایان لە مەڕومالاتەکەیان بێت تا نەچنە ناو باخ و باخاتی خەڵکەوە، بۆیە پێویستە بەرهەمی ئەمساڵی مەڕومالات لە بری بەروبومی کشتوکاڵەکە بدەی بە خاوەن باخچەکە..
لەو کاتەدا داوود هاتە دەنگ، گوتی: کوڕەکەم بۆچی حوکمی ئەوەت نەدا کە بە ئەندازەی بەرهەمەکە مەڕومالات بە خاوەن باخچەکە بدات، خۆ ئەوە حوکمی زانایانی بەنی ئیسرائیلە؟
سولەیمان گوتی: بەڵێ، ڕاستە ئەوان بەم شێوەیە حوکم دەدەن، بەلام ئەگەر سەرنج بدەی دەبینی کە مەڕەکان بەروبومی درەختەکانیان خواردووە نەك درەختەکان و لەساڵی ئاییندەدا درەختەکان بەروبوم دەدەنەوە..لەبەر ئەوە منیش حوکمی ئەوەم دا کە قەرەبووەکە لە بەرهەمی مەڕومالاتەکە بێت، نەك لە مەڕومالاتەکە !
لەوکاتەدا خوا سروشی بۆ داوود نارد: (ئەی داوود ئەوەی سولەیمان دەیلێت حوکمێکی دادگەرانەیە).
پاشان خوا پێی فەرمو: (ئەی داوود تۆ شتێکت ویست و منیش شتێکی ترم ویست).
لەبەر ئەوە داوود لە جێنشین کردنی کوڕە گەورەکەی پەشیمان بووەوەو بە بڕیاری خوا ڕازی بو) .
بەڵێ ئەی لوقمان ئەوە یاسای خودایە، کە لەگەڵ هاتنی مرۆڤ بۆ سەرزەوی دانراوە، تەنیا بۆ ئەوەی مرۆڤ تایبەتمەندی خۆی هەبێت و جیا بکرێتەوە لە بونەوەرەکانی دی..

هەرچی لە زەمیندا هەیە خوا بۆ خزمەتی ئەو بونەوەرە فەراهەمی کردووە، بەڵێ ئەو گەورەی زەمینە..
لوقمان چو بۆ بەیتولمەقدیس، بۆ دیداری داوود، کە لە نێو ئاپۆرای خەڵکدا دانیشتبو و گوێی بۆ گیرو گرفتەکانیان دەگرت..
بەڵێ، ئێستا لوقمان لەلای داوودە و بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەن..
لوقمان سەرنجی شان و شەوکەت و خۆ بەکەمزانی و ڕووە نورانییەکەی دەدا..
داوود پرسیاری لێکرد: چۆن بەیانیت کردەوە لوقمان؟
گوتی: لەژێر چاودێری کەسێکی تردا بەیانیم کردەوە..
داوود بە وەڵامەکە سەرسام بو!
خەڵك قسەیان دەکرد و لوقمانیش بێدەنگ، داوود گوتی: ئەی لوقمان شتێك بڵێ..
گوتی: قسەکردن بە یادی خوا نەبێت سودی نییە..
بێدەنگیش سودی نییە، ئەگەر بۆ بیرکردنەوە نەبێت..
مرۆڤی دیندار پێویستە ئارامگربێ،
سوپاسگوزار و خۆ بەکەمزان بێ،
ڕەزامەند و دڵنەوابێ،
بەسەر دنیادا زاڵ بێت و ئازاد بێ،
خۆشەویست و دڵئاوا بێ،
خەڵك لە ئاسودەییدا بن و خۆی ماندو بێ.
داوود بە سەرسامییەوە فەرموی: ڕاست دەکەی ئەی لوقمان..
پیرۆزت بێ، بەڕاستی خوا دانایی پێبەخشیوی.

* * *

ئەم ڕۆمانە یەکەمین کتێبە -بەشێوەی ڕۆمان- ژیاننامەی دانای گەورەی ڕۆژهەڵات (لوقمانی حەکیم) دەتوێژێتەوە، لە قۆناغی کۆیلایەتی، بە تێپەڕبون بە قۆناغی ئازاد بونی.. پاشان قۆناغی ئازادی تەواو و هاوسەرگیری و تاقیکرانەوەی بە مردنی منداڵەکانی و هاوسەرەکەی و گەڕان بە کون و کەلەبەرەکانی زەویدا.. هەروەها ئەم ڕۆمانە تێڕوانینی ئەو دانایەی لە خۆگرتووە بۆ مرۆڤ و دانایی، تێڕوانینی بۆ مرۆڤ و دنیا و دواڕۆژ و ئافرەت و هاوسەرگیری و باوکایەتی و کارەساتەکان و پەیوەندییە مرۆییەکان و ماڵ و سامان و ئازادی.. هەروەها ئەو قۆناغە گرنگەی ژیانی لەخۆگرتووە، کاتێك بانگەوازێکی گوێ لێبو:

ئەی لوقمان، دەتەوێ خوا بتکات بە جێنشین لەسەر زەویداو بە دادگەری دادوەری لەنێو خەڵکدا بکەی؟ دەکەوێتە سەر ئەژنۆ و بەترس و لەرزەوە دەڵێت: ئەگەر پەروەردگارم سەر پشکم بکات، ئەوا سەلامەتی هەڵدەبژێرم، بەڵام ئەگەر فەرمانم پێبکات، ئەوا بەسەر سەر و سەر چاوم قەبوڵی دەکەم، چونکە دەزانم کە پشتم دەگرێت.. لە ڕێگەی قۆناغە مێژووییەکانی بونی ئەو کەسایەتییە لە جیهاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە کێشەی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان نەبونی پیاوی دانا و داناییە و بۆمان دەردەکەوێت، کە چۆن دانایی دەتوانێت خزمەتێکی زۆر پێشکەشی مرۆڤ بکات و بەرزی بکاتەوە.. ئەم ڕۆمانە زۆربەی ئەو وتانەی ئەو مرۆڤە دانایە بۆی جێهێشتوین بۆمان دەخاتەڕو. لە پەند و ئامۆژگاری و دیداری لەگەڵ پێغەمبەر داوود و گفتوگۆی دانایی و پێغەمبەرایەتی.

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
COVER DESIGN
2500 دینار